## ناسنامەی کتێب

**ناوی پەرتوک: ڕێگای ڕوناک بۆ باوەڕی پاک**
**بابەت: بیروباوەڕ**
**نوسین و ئامادەکردنی: صلاح الدین محمد هەولیری**
**چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٨**
**چاپخانەی:**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارەی سپاردنی ( ١٠٢٨ ) ی ساڵی( ٢٠١٧ )ی پێدراوە**



پێشکەشه بە:-

- دایـک و بـاوکم کەلەبچـووکیمدا زۆر پێمـەوه مانـدوو بـوون وەلەکاتی پیرییاندا زۆر پێمەوه بیٚ نازو خەفەتبار بوون.
- هەموو موسڵمانێکی پەرۆش بۆ بەدڵدا کردن و بەرجەستە کردنی باوەڕێکی پاک لەخۆی، بەمەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاری بەرزی خۆی.
- هەموو باوەڕدارێکی کۆشش کار بۆ گێڕانەوەی پەیام و بەرنامەی خودای کردگار بۆ نێو ژین و دونیای خەڵکی ستەملێکراوو هەژار.

# پێشەکی

**إنَ الحمدللهِ نحمدهُ ونستعينهُ، ونستغفرهُ، ونعوذُ باللهِ من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده اللهُ فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهدُ أن محمداً عبدهُ ورَسُوله.**

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ }.

آل عمران: ١٠٢

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا}. النساء : ١

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا}

الأحزاب: ٧٠ - ٧١

**أما بعد :**

**ستایش بۆ خوا هەرچەندە لە بواری بیروباوەڕدا نووسراوو بڵاوکراوەی زۆرهەن و تارادەیەکی باش بوون بەسەرچاوەو بەرچاو ڕوونی و مایەی سوود و زێدەزانیاری‌بۆ گەنجی موسڵمان، بەڵام هێشتا لەچاو ئەم هەوڵ و هەرایەی دوژمنانی ئیسلام دەیدەن بۆ دوورخستنەوەو بەلاڕێدانی موسڵمان زۆر کەمە، ئینجا لەسەر بۆتەی ڕۆژگاریشدا (أرض الواقع)لەئێستادا بار بەلای دوژمناندایە، لەبەر ئەوەی لە هەموو وولاتانی موسڵماندا چ بەشێوەیەکی ڕاسەوخۆ یان ناڕاسەوخۆ ئەوان لەسەر کورسی و عەرشی دەسەڵاتن، وەپول و پاسەوانیشیان لەپشتە، بەڵام ئەمە تەنها بەش و پشکیتیان لەدونیادا لەم سات و وەختە،**

**کەدیارە ئەمەش هەر لەژێر ویستی خوای پەروەردگارە لەوکاتانەی موسڵمان لە هەوڵیدا بۆ بەرزێتی پەیامەکەی لاوازو سستە، هەروەکو خوای کاربەجێ فەرموویەتی :ــ** { وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ }. النساء: ١٤١

جا ئەگەر بێ باوەڕان ئەم پشک و بەشەیان هەبوو لەهێزو فرمانڕەواییدا دیارە هۆکارەکە لە موسڵمانان خۆیاندایە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :

{أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} آل عمران: ١٦٥

ئینجا بەخۆداچوونەوە بۆ زانینی هۆکارەکان و خۆ ڕاست کردنەوە نیوەی چارەسەرە، نیوەکەی تریش هەوڵ و کۆشش و هەنگاو نانە بە پەلە، بۆ ئەم مەبەستە نابێ هەوڵ و کاری هیچ موسڵمانێک بە کەم سەیر بکرێ بەمەرجێک لەشوێن و کاتی پێویستی خۆی بی، کەواتە دەبێ هیچ هەوڵێک هەڵنەگیرێ و دوانەخرێ لەبەرەو دروست کردنەوەی کۆمەڵگایەک کە بیروباوەڕێکی ڕاست و پاک ڕێبەری بکات و خوا پەرستیەکی دروست و ساغ لە خلت و خاڵەکان پاکی بکات و هەست و سۆزو ئاکاری بەرز جولە بە ئەندامەکانی بکات و بڕیارو یاساکانی ئیسلام فەرمانڕەوایی بکات، چونکە ناکرێ بڵێین ئیسلامێک کە باسی بچووکترین هەڵس و کەوتی مرۆڤی کردبێ و ڕێنمایی جوان و دروستی بۆ دانابێ، کەچی باسی بەڕێوەبردنی دەسەلاتی لەیاد کردبێ و فەرامۆشی کردبێ ،

بۆیە دەبێ پەندو ئامۆژگاری لە هەڵەی ڕابردوو وەربگیرێ و داهاتوویەکی ڕێک و ڕاستری لەسەر بنیات بنرێ، تەنانەت ژەنگی تاوان و چرک و پیسی ئاکارو بەد ڕەفتاریەکانی سەردەمیش (چ ناوخۆییەکان و چ ئەوانەش کە لەدەرەوە هێنراون) لابدەین بە گەڕانەوە بۆ نموونە بەرزو ئاکارە جوان و ڕەفتارە ڕەنگینەکانی پێشینە چاکەکانمان، چونکە خەڵکیش وەک توخم و کانزاکان جۆراوجۆرن،هەروەک پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ)دەفەرمووێ : ـ(**الناسُ معادن كمعدن الذهب والفضة، خيارهم في الجاهلية خيارهم في الإسلام إذا فقهوا**)[1].

---

(١) رواه مسلم

ئینجا ئاکارو نەریتە بەرزەکان هەروەکوو زێڕو زیو نرخ و بەهای خۆیان لەدەست نادەن بەدرێژایی زەمەن و تەمەن، بەلاَم دەبێ بزانین کە وەک چۆن زێڕو زیوو کانزا بەنرخەکان ئەگەر لەژێر گڵ و لەنێو سگی زەویدابوو سوودی نیە تا دەرنەهێنرێ، بەهەمان شێوە گەنجینەی ڕابردووی ئیسلامیش لە پەڕاوە سپیەکانی بیروباوەڕ و گۆڕەپانە سوورەکانی جیهادو جەنگاوەر، سوودی تەواوی لێ نابینرێ هەتا نەهێنرێتەوە یادو بیری گەنجان و بەوێنەی کالاَ نەکرێتە بالاَی خەڵک و جەماوەر، دیارە ئەمەش سەرەتا بەجولاَندنی قەڵەمە چەق بەستووەکانە بەسەر کاغەزە تۆز لەسەر نیشتووەکان، چونکە هەر ووشەی سەر زاری قەڵەمە دەبێتە تەوژمی تیژی ڕەم، هەر پەڕاوو کاغەزی بەردەم زانایانیشە دەبێتە هەوێنی دروست بوونی پۆڵێ پیاوی مەردو جەنگاوەری بەغەم، غەم لە بلاَوبوونەوەی بیروباوەڕی پووچ و کاڵبوونەوەی باوەڕی موسڵمان، غەم لەغەریب بوونی ئیسلام و موسڵمانان لەنێو شاری خۆیان و ناخی نیشتمان، غەم لەبێ نازولاوازی ئەم ئایینە لەنێو ملیۆنەها گەنجی بێ هۆش و بێ ئاگا لەپیلانی دوژمنان، غەم لەبێ غەمی زۆر لە زانایان لە بەلاڕێداچوونی ڕۆڵەکانیان، غەم لە پڕبوونی مزگەوت و ماڵەکانی خوا لەبیدعەو بێ دینەکان، غەم لەپڕبوونی شەقام و ماڵە موسڵمانەکان لە مەی فرۆش و مەی خۆرو ماددە هۆشبەرەکان، غەم لەبەرزی کۆشک و تەلارەکان و پڕبوونیان لەبەد ڕەوشتەکان، غەم لەهەرزانی خوێنی موسڵمان و هەتک کردنی ناموسی خوشکانمان لە دەوروبەرمان.

## في ضميري في دمي في مهجتي صوت الآف الحزانا أمتي

داواکارم لەخوای گەورە لەهەر هەڵەیەک هیواو هەوڵێک بۆ خۆڕاست کردنەوە بێتەجێ، خوای گەورە لەهەر هەوڵێکیش هەڵێک بۆ ئەم ئایینە بڕەخسێنێ، لەم نوسراوەشدا کە هەندێ بابەتی بیروباوەڕم هێنایتە دەر، بە ئومێدی ئەوەی بیروڕای چەوت و خاڵی ڕەش لە دڵ بێتەدەر، سەرەنجام گوفتاری ڕاست و کرداری چاک بۆ باوەڕدار بێتە بەرهەم و بەر، خودایە داوات لێ دەکەم کە

ئەم کارەم تەنها لەپێناو ڕەزامەندی تۆ بێ، پاشان بۆ هەموو موسڵمانێکیش بەسوودبێ، لەدوا ڕۆژیشدا بۆ منی هەژار مایەی ڕەحمەتی خواو ڕزگاربوون بێ، جا ئەوەی ڕاست بووبێ، وە مەبەستی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووبێ، ئەوا هەقەو فەزڵ و منەتی خوایە بەسەرمان کە ڕێنموونی بۆ کردووین، وە ئەوەی هەڵەو چەوتیە لەمن و شەیتانە، خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێ ی بەرین، پاشان من یەکەم کەسم کە لێ ی بەریم، خودای گەورە لە گوناهو کەم و کوڕی من و دایک و باوکم و هەموو خوشک برایەکی باوەڕدار خۆش بێت .

(( ربنا تقبل منا اِنک أنت السمیعُ العلیم ))

وصلی اللهم وبارک علی نبینا محمد وعلی الهِ وصحبهِ وسلم تسلیما

واخر دعوانا ان الحمدُللّه رب العالمین

صلاح الدین محمد هه ولێری

٩ /محرم/١٤٤٠کۆچی

٢٠١٨/٩/٢٠میلادی

هەولێر/ ڕۆژی جمعه

## بەشی یەکەم

ــ چەمک و مانای بیروباوەڕ (**تعريف العقيدة**)

ــ مانای ((**لَا إله إِلَّا اللّه**)) (معنى (**لا إله إِلَّا اللّه**)

ــ مانای باوەڕ ((معنى الإيمان))

ــ باوەڕ گوفتارو کردارە (**الايمان قول وعمل**)

ــ مانای تاغوت و جۆرەکانی (**معنى الطاغوت وأنواعهُ**)

ــ جۆرەکانی بەتاک و تەنها گرتنی خودا (أنواع التوحيد)

ــ مانای پەرستن (**العبادة**) و جۆرەکانی

# چەمک و مانای بیروباوەڕ (**العقیدة**)

ووشەی (**عقیدة**) یان (إعتقاد) :ـ

بریتیە لەو بیروباوەڕەی بە دڵەوە گرێ دەدرێ و تێیدا ئۆقرە دەگرێ، جا ڕاست بێ یان چەوت .

بەلام لەمانای دەستەواژەی تایبەتدا (**الإصطلاح الخاص**) لای (**أهل السنة والجماعة**) بریتیە لە :ـ

باوەڕی ساغ و دامەزراو بەخوداو ئەوەی پێویستە بۆ خودا بڕیار بدرێ لەکارە پەرستنەکان و پەروەردگاریەتی و ناو و سیفاتە بەرزەکانی هەروا باوەڕی بە مەلائیکەتەکان و پەرتووکەکان و پێغەمبەران(علیهم الصلاە والسلام)و ڕۆژی دوایی و قەدەری خێرو شەڕ، وەبە هەموو ئەو دەقە ڕاستانەی هاتووە لەبنچینەکانی ئایین و باس و هەواڵەکانی بابەتە پەنهان و نهێنی یەکان، وە ئەوەش کە پێشینە چاکەکان لەسەری کۆک بوون، ئینجا مل کەچ بوون بۆ خودا لە دەسەلات و فەرمانڕەوایی و پەیامەکەی، وەبۆ پێغەمبەرەکەشی (ﷺ)بەگوێ ڕایەڵی کردنی و شوێن کەوتنی و گەڕاندنەوەی کێشەو کاروبارەکان بۆ ژێر دادگەریەکەی[1] .

سەرەتای بیروباوەڕیش ئەوەیە کە مرۆڤ لە ئەنجامی ئەوەی دەیبیستێ لە فەرمایشتەکانی خوای گەورەو ئەوەش کە دەیبینێ لە دروستکراوەکانی بگاتە ئەو بیروڕایەو گومانی نەبێ کە ئەم بوونەوەرەو ئەوەی تێیدایە پەروەردگاری تاک و تەنها (**اللّـه**) بەدی هێناوەو دروستی کردووە و هەریەک و هەرشتێک بەگوێرەی پێویستی خۆی بە جوانترین شێوەو بێ هیچ کەم و کوڕیەک شێوەسازی بۆ داناوەو بەڕێوەی دەبات، ئینجا هەردەبێ ئەو خودایەش بەتەنها بپەرسترێ و پەیڕەوی فەرمان و بەرنامەکەی بکرێ، هەروەکو دەفەرموێ:

---

(١) بحوث ودراسات في عقيدة أهل السنة ـ ناصر العقل /١١.

{أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ} الأعراف: ٥٤

واتــە : ئاگــاداربن و بــزانن کــە هەرچــی دروســتکراوێک هەیــە خاوەنداریێتی یەکەی بۆ خودایەو هەرئەویش خاوەنی فـەرمان و بڕیارە بەسـەر دروسـتکراوەکانی، پیـرۆز و گـەورەیـە خـودای پـەروەردگاری جیهانیان .

ووشــەو نــاوی (الــرب) واتــە پــەروەردگار، کــە ئــەویش چــەند سیفەتێکی پەروەردگاریەتی بەرزو بێ وێنە و تەواوی لە خۆگرتـووە بەسەر دروستکراوەکانی کە بریتین لە :ـــ

١ - دروستکردن (الخلق)

٢ - ڕۆزی دان (الرزق)

٣ – بەڕێوەبردن (تدبير الامور)

٤ - ژیاندن (الاحياء)

٥ – مراندن (الإماته)

ئینجا کەئەم سیفەتانەش تـەنها لـەخودای پـەروەردگاردا هەیـە، هــەروەکو لــە ئاســماندا پەرســتراوە دەبــێ لەســەر زەویــش تــەنها پەرستراوبێ هەروەکوو دەفەرمووێ: {وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَـٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَـٰهٌ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ} الزخرف: ٨٤

بـەلام ئیبلیس (نـەفرەتی خـودای لـێ بـێ) هـەوڵی داوە کـە لەسـەر زەوی لە مرۆڤەکان خۆیان کەسێک یـان شـتێکی تـر بـە درۆو نـاڕەوا بکـات بـە هاوشێوەی خـودا (عزوجل) یـان وایـان لـێ بکـات خۆیـان بکەن بـەخاوەنی چـەند سیفەتێکی وەکـوو ڕۆزی دان و سـوودو زیـان گەیاندن، یان ژیاندن و مراندن، یـان کاروبـار بـەڕێوەبردن ئـەویش لـە ڕێگای دەسەلات و فەرمانڕەواییانـدا بەسـەر خـەڵکی، ئەمانـە هـەموو بــە مەبەســتی ئــەوەی بپەرســترێن و گــوێ ڕایــەڵی تــەواو بکــرێن و خــەڵک دوورخەنــەوە لــە پەرســتراوی هــەقیان، هەربۆیــە خــودای پــەروەردگار پێغەمبــەران و پــەیام بــەرانی زۆری ڕەوانــەکردووە تــا خــەڵکی ئاگــادار بکەنــەوە و بیــان گەڕێننــەوە بــۆ بەندایــەتی و



پەرستنی خودای ڕاستەقینە و ڕزگاریان بکەن و دووریان بخەنەوە لە خوا درۆیینەکان،

هەروەکوو دەفەرمووێ : {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ} النحل: ٣٦

واتە: ـ سوێند بەخوا لەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت : تەنها خوا بپەرستن و وازبهێنن و دووربکەنەوە لە هەموو پەرستراوێکی تر .

کەواتە پەرستنی خوای تاک و تەنها مەبەست و ئامانجی دروستکردنی ئەم بوونەوەرەیە، هەروەکو فەرموویەتی:-

{ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ } **الذاريات**: ٥٦

واتە : ـ بێگومان من پەری (جن)و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و گوێڕایەڵیم بکەن .

بۆیە خوای گەورە ئەم مەبەستە گەورەی کۆکردۆتەوە لەیەک ووشەدا ئەویش((**لَا إِلَه إِلَّا اللّه**)) یە.

کەئەویش لە دووبەش پێک هاتووە :

یەکەم : **لَا إِلَه**

دووەم : **إِلَّا اللّه**

## ماناى ((**لَا إِلَه إِلَّا اللَّه**))

**لَا إِلَه**: واتە هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە

**إِلَّا اللَّه** : تەنها **اللّه** پەرستراوی هەقەو شایستەی پەرستنە .

كەواتە دەبێ لەبەشی یەكەمی(**لَا إِلَه إِلَّا اللَّه**)كەبریتیە لە (**لَا إِلَـه**) هەمووشتێك ڕەت بكەیەوەو خۆتی لێ بەری بكەی كە بەناهەق دەپەرستریٚ بێجگە لە خوا، جا ئەوشتانەش چ بەردو بتی داتاشراوبێ یان هاوشێوەی دانراو یان تاغوت یان قەبر یان ڕێباز یان بیردۆز یان هەرشتێكی تر كە بەناهەق دەپەرستریٚ.

ئینجا لەبەشی دووەمی (**لَا إِلَه إِلَّا اللَّه**) كەبریتیە لە (**إِلَّـا اللّـه**) هەموو پەرستنێكی شایستە بڕیار دەدەی بۆ خودای تاك و تەنها .

كەواتە بۆ ئەوەی تەنها خوای پەروەردگار بپەرستی پێویستە سەرەتا هەموو پەرستراوەكانی تر بە بەتاڵ و ناڕەوا بزانی و لێیان دووربكەویەوەو دوژمنایەتیشیان بكەی، هەروەكوو خوای گەورە فەرموویەتی:ـ

**{فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُـؤْمِن بِاللّـهِ فَقَـدِ اسْتَمْسَـكَ بِالْـعُرْوَةِ الْوُثْقَى}**

**البقرة**: ٢٥٦

واتە :ـ جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بەتاغوت و باوەڕ بهێنێت بەخوا ئەوا ئەوكەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆكاری ڕزگاری و بەشوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ كەوتووە .

## ماناى باوەڕ (معنى الإيمان) :

کەواتە ووشەی باوەڕ (الاِيمان) لە زمانەوانیدا[*] دوو واتای هەیە :-

یەکەمیان :- (**الأمن**) بەمانای پێدانی ئارامی و ئاسایش و دڵنیایی ، کە پێچەوانەی ترسە، وە دڵنیام کرد پێچەوانەی ترساندنە .

دووەمیان :- (التصديق) بەڕاست دانان، واتە : ئەوکەسەی بەکردار قسەی خۆی بەڕاست دەخاتەوە .

وەبەڕاست دانانیش پێچەوانەی بەدرۆخستنەوەیە(**التكذيب**). ئینجا ئەگەر بەندە بڵێ : باوەڕم هێنا بەخودای گەورە کە پەروەردگارە،واتە : بەڕاستی دادەنێم {**وَمَا أنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ**} يوسف: ١٧

ابن تيميه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ:-

(**وذلك إنما يحصل إذا استقر في القلب التصديق والانقياد**)[1].

واتە : ئەم ئاسایش و دڵنیایی یە بەدەست دێ کاتێ بەڕاست زانین و مل کەچی لەناو دڵدا جێگیر دەبێ .

بەلاّم لەدەستەواژەی شەرعیدا هەروەکوو لە بنچینەیەکدا هاتووە کە بریتی یە لە: گوفتارو کردار، گوفتاری دڵ و زمان و کرداری دڵ و زمان و ئەندامەکانی لەش، باوەڕی ڕاستەقینە لەلای

---

(*) كتاب الايمان ، ١٥.

(١) الصارم المسلول على شاتم الرسول ٩٦٧/٣.

ئەهلی سوننەوجەماعە دەبێ ئەم پێنج بابەتە لەخۆ بگرێ تاوەکوو باوەڕێکی پاک و ساغ دەستەبەر بکرێ :ـ

گوفتاری دڵ کە بریتیە لە بەڕاست دانان و باوەڕو ناسینی .

کرداری دڵ کە بریتیە لەنیازو مەبەستی پاک و خۆشەویستی و ڕووکردنە خوا.

کرداری زمان کە خوێندنی قورئان و ژیکرو یادکردنی خوداو داوای لێخۆشبوون کردن و ئەو شتانەش کە بەزمان دەکرێ .

کرداری ئەندامەکانی لەش وەکو کڕنۆش و سوژدەبردن و هەنگاونان بۆ مزگەوت و جیهادکردن و فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لەخراپە[1].

---

(١) قواعد في بيان حقيقة الايمان عند أهل السنة والجماعة –١٢٧ بەکورتکراوەیی.

## باوەڕ گوفتارو کرداره (الإيمان قول وعمل) :

ئینجا ئەوەی پێشینە چاکەکان و زانایان و شارەزایانی لەسەر بووە ئەوەبووە کە باوەڕ بریتیە لە گوفتارو کردار، زیاد ئەکات و کەم ئەکات، هەروەکو ئیمامی احمد بن حنبل (رەحمەتی خوای لێ بێ)فەرموویەتی :ـ (**أجمع تسعون رجلاً من التابعين، وأئمة المسلمين، وأئمة السلف، وفقهاء الامصار على أن السُنة التي توفي عنها رسول الله** (ﷺ) ..... **فذكر أموراً منها ـ : الايمانُ قول وعمل، يزيد باطاعة، وينقُصُ بالمعصية**)[١] .

واتە (٩٠) کەس لەتابعینەکان و پێشەوایانی موسڵمانان و پێشەوایانی پێشینەکان و شارەزایانی ناوچەکان کۆ دەنگ بوونە لەسەر ئەوەی کەوا ئەو رێبازەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەسەری کۆچی دوایی کردووە ...... چەند شتێکی باس کردووە ، لەوانە ئەوەبووە کە باوەڕ گوفتارو کردارە، بەگوێڕایەڵی کردنی چاکە زیاد دەکات و بەتاوان و سەرپێچی کردنی خودا کەم دەکات .

هەروەها ئیمامی بغوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ ـ(أتفقتِ الصحابه والتابعون ومن بْعدهم من علماء السنه على أن الأعمال مِنْ الايمان..... وقالوا : إن الايمان قولُ وعمل وعقيده) [٢].

واتە : هاوەڵانی بەرێزو تابعینەکان و ئەوانەی دوای خۆشیان لەزانایانی سوننە یەکڕان لەسەر ئەوەی کردەوە بەشێکە لەباوەڕ ... وە ووتویانە : باوەڕ گوفتارو کردارو بیروباوەڕە .

هەروەها محمد کوڕی عبدالوهاب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

---

(١) طبقات الحنابلة ابن رجب الحنبلي ١٣٠/١.

(٢) شرح السنة ٣٨/١.

(**لا خلاف أن التوحيد لابد أن يكون بالقلب واللسان والعمل، فإن اختلَ شئ من هذا لم يكن الرجل مسلماً، فإن عرف التوحيد ولم يعمل به فهو كافر معاند ككفر فرعون وإبليس وأمثالهما**)(١).

واتە : ڕای جیا نیە لەسەر ئەوەی ناسین و پەرستنی خودای تەنها دەبێ بەدڵ و زوبان و کردەوە بێ، جا ئەگەر هەریەکێک لەمانە کەم و کوڕی تێ کەوت و نەما ئەوا ئەوکەسە نابێتە موسڵمان، ئینجا ئەگەر ناسین و پەرستنی خودای زانی بەڵام کاری پێ نەکرد ئەوا کافرێکی سەرکەشە وەک کوفری فیرعەون و ئیبلیس و وێنەی ئەوان .

ئینجا خۆ گومانی تێدانیە کە ئامانج و مەبەست لەدروستکردنی مرۆڤ و پەری (**الإنس والجَن**) پەرستنی خودای تاک و تەنهایە کە ئەویش هەرسێ بەشی دەروون و گوفتارو کردار دەگرێتەوە، لەکاتێکدا بەڕاست زانین (**التصديق**) تەنها بە دڵە، بەڵام پەرستن سەلماندن و ڕەنگدانەوەی ئەو باوەڕەیە کە بەڕاستی دەزانی بەکردار،

هەروەکو ابن تيميه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ

(**على الخلق أن يعبدوه فيطيعوا أمره ويستعينوا به على ذلك كما** قال تعالى : {**إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ**}**الفاتحة** ٥ (٢)

واتە لەسەر خەڵکی پێویستە خودا بپەرستن بەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن و هەر لەویش داوابکەن کە یارمەتیان بدات لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەم کارە هەروەکوو خودا دەفەرمووێ : {إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ }.

ئایا کەس هەیە بڵێ داوای یارمەتی و کۆمەک کردن لەخوا (الاستعانە) پەرستن نیە ؟ ئەی بۆچی خودا (سبحانە وتعالى) جیای

---

(١) شرح كتاب كشف الشبهات : ١١٦.

(٢) العبادة وحقيقة العبودية :١٧.

کردۆتەوە لە (**إِيَّاكَ نَعْبُدُ**) ؟ جیاکردنەوەکە لەبەر گرنگی (**الاستعانة**)یە لە پەرستنی خودای گەورە چونکە هیچ کەسێک هیچ کارێکی پەرستشی پێ ئەنجام نادرێت بەبێ کۆمەک و یارمەتی خودای پەروەردگار، کەواتە وەکو جیاکردنەوەی (**الاستعانة - إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ**) لە (**العبادة - إِيَّاكَ نَعْبُدُ**) مانای جیاوازی ئەم دووانە نیە لەیەکتری بەهەمان شێوە لەم ئایاتانەی کردار (**عمل صالح**) جیاکراوەتەوە لە باوەڕ (الإيمان) مانای جیاوازی نیە لەیەکتر، بەڵکو گرنگی کرداری چاک دەردەخات لە بەدیهێنانی باوەڕ، نمونەی ئەم قسەیەش زۆرە لە قورئانی پیرۆز هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا} الكهف: ١٠٧

هەروەها دەفەرمووێ :ـ

{ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ } ص: ٢٤

هەروەها دەفەرمووێ :ـ

{إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ} العصر: ٣

لە سورەی (**طـه**)ئەم تێک هەڵکێشیەی باوەڕوکردار زۆر بەڕاشکاوی هاتووە، کە لەئایەتی (٧٥) دا بە ووشەی (**قد**) کەبەمانای (تحقيق) دێت واتە : سەلماندن و بەرجەستەکردن ، خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَى} **طه**: ٧٥

واتە : هەرکەسێکیش بچێتەوە لای خودا بە باوەڕداری، باوەڕەکەشی بەرجەستەکردبێ بەوەی کردەوە چاکەکانی ئەنجام دابێ (فەرزەکان و سوننەتەکان) ئەوا بۆ ئەمانە پلەو پایەی بەرز هەیە .

ئینجا هەروەکو تەنها باوەڕێکی ڕووتی بێ کردەوە هیچ سوودی نابێ بۆ خاوەنەکەی[*]، هیچ کردەوەیەکی چاکیش سوودی نابێ بەبێ باوەڕی خاوەنەکەی، خودای گەورە دەفەرمووێ :ـ
{ وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا } **طه**: ١١٢

واتە :ـ هەرکەسێک لە کارە چاکەکان ئەنجام بدات و باوەڕداربێت ئەوا هیچ ترسێکی نیە لە ڕۆژی دوایی لەوەی تاوانەکانی لەسەر زیاد بکرێ، وە نەترسی هەیە لەوەی چاکەکانی لێ کەم بکرێتەوە .ئەگەر هەرکەسێکیش مۆڵەتی پێ بدرێ کە جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر دونیا بۆئەوەی باوەڕ بهێنێ بێ گومان دەبێ پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەری ئەوکاتەش بکا، هەروەکوو هەموو نەتەوەکانی پێش ئیسلام لە ژیانیاندا، خۆیان و بگرە پێغەمبەرەکانیشیان داوایان لێ کراوە

کە ئەگەر هاتوو لەسەردەمی ئەواندا پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)بۆیان هات دەبێ بڕوای پێ بهێنن و شوێنی بکەون و سەری خەن، بە پێچەوانەوە ئەگەر پشتی تێ بکەن ئەوا لەبێ باوەڕان دەبن، خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

**{وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ , فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ}** آل عمران: ٨١ - ٨٢

---

[*] بێ گومان ئەوکەسەی باوەڕ دەهێنێ پاشان بمرێ پێش ئەوەی زانیاری ئەوەی پێ بگات کەچ پێویستە لەسەری بیکات، ئە وە باوەڕدارەو لەخەڵکی بەهەشتە، وەکو هاوەڵانی ئوخدود هەروەها ئەگەر کەسێ باوەڕی هێنا ئەوا سەیری دەکرێ کە ئایا لەدوای باوەڕهێنانی کردەوەکان ئەنجام دەدا یان نا ، خۆ ئەگەر مل کەچی هیچ فەرمانێک نەبوو ئەوا باوەڕەکەی هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێ، وێنەی ئەم قسەیە سەیری ، (مجموع الفتاوى – ٣١٦/٧ – ٣١٧) بکە .

واتـــه : ـــ وەکاتێـــک خـــودای گـــەورە پـــەیمانی وەرگـــرت لەپێغەمبـەران (سـەلامی خوایـان لـێ بـێ) کـە هەرچیەکم پـێ داون لەنامەو بەرنامە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆهات کە ئەوەی لای ئێوەی بەڕاست زانی، ئەوا دەبێ بڕوای پـێ بهێنن و پشتیوانی بکـەن و سـەری بخـەن، خـودا فەرمووبـەتی : ئایـا دانتـان نـا بـەم پەیمانـە ؟ وە لەسـەر ئەمـەش پـەیمانی منتـان وەرگـرت ؟ پێغەمبـەران ووتیـان دانمـان نـا، فەرمووی : کەواتە شاهێدبن و منیش یەکێکم لە شاهێدەکان، جا ئەوەی پشتی هەڵکرد دوای ئەم داننانـە ئـەوا هـەر ئەوانـەن دەرچوون لەگوێڕایەڵی کردنم. بێ گومان پێغەمبەران (سـەلامی خوایـان لـێ بـێ) پەیمانەکـەیان بردەسـەرو نەتـەوەکانیان لـەهاتنی ئـەم کۆتـا پێغەمبەرە(ﷺ)ئاگـادار کـردەوە، بـەلام لـەدوای ئـەوان کۆمـەڵێک هاتن نەگوێڕایەڵی پێغەمبەری خۆیان بوون و نەباوەڕیشیان بـە کۆتـا پێغەمبەر(ﷺ)هێنا، بۆیە خـوای گـەورە بـاوەڕدارانی ئاگـادارکردەوە کـە ئەگـەر گوێڕایـەڵی ئـەم کۆمەڵـە بـێ بـاوەڕە بکـەن، ئـەوا ئێوەش بێ باوەڕ دەبنەوە، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ : ـ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا فَرِيقًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ } آل عمران: ١٠٠

وەنـەبێ هەرتـەنها گوێڕایـەڵی کردنـی ئـەم کۆمەڵـە لـەخاوەن پەرتووکـەکانی پێشـووی قەدەغـەکردبێ، بـەڵکو گوێڕایـەڵی کردنـی بـێ بـاوەڕان بەگشـتی سـەرەنجامەکەی هەڵگەڕانەوەیـە لـــەئایین و زەرەرمەنـــدی دواڕۆژو ژینـــە، هـــەروەکو خـــوای گـــەورە دەفەرمووێ : ـ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ ،بَلِ اللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ} آل عمران: ١٤٩-١٥٠

بەڵکو پێویستە باوەڕدار پشت بکات لەبەرنامەی ئەوانەی پشت لەبەرنامەی خوا دەکەن :

{فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا } النجم: ٢٩

ئەم ئایەتانەو هی تریش مەترسی گەورەی پشت هەڵکردن(*) دەردەخات، هەروەکو ابن تیمیه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :
(**وقد تبيَن أن الدين لابُدَ فيه من قول وعمل، وأنه يمتنع أن يكون الرجل مؤمناً بالله ورسوله بقلبه، أو بقلبه ولسانه، ولم يؤدِ واجباً ظاهراً، ولا صلاة ولا زكاةً ولا صياماً، ولا غير ذللك من الواجبات**) [1].

واتە : ڕوون بووەوە کەوا ئایین پێویستە گوفتارو کرداری تێدابێ، وەناکرێ کەسێ بەدڵ باوەڕی هەبێ بەخودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)یان بەدڵ و زوبانی، کەچی هیچ واجبێکی دیار ئەنجام نەدات، نە نوێژ، نە زەکات، نە ڕۆژوو، نە هەرشتێکی تر لە واجبەکان .

ئینجا سەرنج بدە لە گرنگی و تایبەتمەندی ئەم دووکردارە (نوێژو زەکات) لەنێو کردارە واجبەکان کاتێ لەسەرەمەرگدا داوا ئەکەن بگەڕێندرێتەوە بۆ دونیا ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

{حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ} المؤمنون: ٩٩ - ١٠٠

واتە :- تا ئەوکاتەی یەکێک لەمانە مردن دەیانگاتێ ، دەڵێ : ئەی پەروەردگارم بم گەڕێنەوە، بەڵکو کردەوەیەکی چاک ئەنجام بدەم لەو شوێنەی جێم هێشتووە .

داوا ئەکات بگەڕێندرێتەوە بۆ ئەوەی باوەڕبهێنێ و ئەو ماڵ و سامانەی کە نەیدەبەخشی و ببوە ڕێگرلەبەردەم باوەڕهێنانی ، ئێستا داوا دەکات مۆڵەتی پێ بدرێ تا ماڵ و سامانێک ببەخشێ و پێی ڕزگاری ببێ،

---

(*) بێ گومان ئەو پشت هەڵکردنەی کە لە ڕەگەزی کردارەکەیە (گوێڕایەڵی) کە مەرجە بۆ ڕاست و دروستی باوەڕ .

(١) مجموع الفتاوى (٦٢١/٧).

هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ــ

{وَأَنْفِقُوا مِنْ مَا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ} المنافقون: ١٠

واتە :ــ ببەخشن هەندێ لەو ماڵ و ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داوون پێش ئەوەی مردن یەخە بە یەکێکتان بگرێ، ئەوسا دەڵێ :ـ

خوایە خۆزگە مردنی منت دوابخستایە بۆ ماوەیەکی تری نزیک ، تا ماڵم ببەخشایە و ببومایە یەکێک لەپیاوچاکان .

ئەم ئایەتە پیرۆزە قسەکەی ئێمە دەسەلمێنێ کەوا هەرکەسێک باوەڕی هێنا ، ئەگەر نەمردو تەمەن و ماوەی پێ درا دەبێ مل کەچ و گوێڕایەڵی ئەو کردەوانەش ببێ کە ڕاست و دروستی باوەڕەکەی پێ دەسەلمێنرێ. ئینجا ئەمانە هەموو زانستی ئەو نهێنیانەن کە لەدوارۆژو داهاتوودا ڕوودەدەن باوەڕدار دەبێ بڕوای پێیان هەبێ، بڕوایەک وای لێ بکات لەپێش خۆیدا کردەوەی بۆ ئامادەکردبێ، هەروەکوو شیخ عبدالرحمن السعدی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)لە ڕاڤەی ئایەتی {وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ} **البقرة**: ٤

دەفەرمووێ :ــ (**حقيقة الايمان هو التصديق التام بما أخبرت به الرسل المتظمن لأنقياد الجوارح**)[1] .

واتە :ــ باوەڕی ڕاستەقینە بریتیە لە بەڕاست زانینێکی تەواوی هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ)هەواڵیان دەربارەی داوە، باوەڕێک کە مل کەچی و گوێڕایەڵی ئەندامەکانی لەش لەخۆ بگرێ .

چونکە بێ گومان ئەگەر نەفس ڕام و جڵەو گیر نەکرێ بەگوێڕایەڵی کردنی خودا، سەرکەش و سنور بەزێن و سەپێچی کار دەبێ، بێ شک سەرپێچی کردن و سنوربەزاندن هاوشانی کوفرو بێ بڕوایی هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا، هەروەکو گوێڕایەڵی

(١) تيسير الكريم الرحمن / ٤٠.

کردنیش لەگەڵ باوەڕدا، بۆ نموونە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:-

{فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّى ، وَلَكِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى} القيامه: ٣١ - ٣٢

{يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّى بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا} النساء: ٤٢

{فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ ، وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا أَفَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَاسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنْتُمْ قَوْمًا مُجْرِمِينَ} **الجاثية**: ٣٠ - ٣١

وە دەربارەی أبو جهل دەفەرمووێ :-

{أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى } العلق: ١٣

هەروەها دەربارەی فیرعەون دەفەرمووێ :-

{فَكَذَّبَ وَعَصَى} النازعات: ٢١

پێشەوا علی کوڕی أبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :- ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ)لە گۆڕستانی بەقیع لە بەخاک سپاردنی مردوویێک پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی :-

(**مامنكم من أحدٍ إلاَّ وقد كُتِبَ مَقعَدُهُ من الجنة ومقعده مِنَ النار**)[1]

واتە :- هیچ یەکێک نیە لە ئێوە ئیلا شوێنی خۆی بۆ دیاری کراوە چ لە بەهەشت، وەیان لە ئاگر.

ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەکەواتە پاڵی لێ نەدەین و واز نەهێنین لە کردەوە ؟

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی :- بەڵکو کردەوە بکەن چونکە هەموو کەسێک کردەوەی ئەو شوێنەی بۆی دیاری کراوە بۆی ئاسان دەکرێت، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە :{ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى} الليل: ٥-٦ تا گەیشتە {**فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى**} الليل: ٧[1]

---

(١) **رواه البخاري** (٤٩٤٥) **ومسلم** (٢٦٤٧).

ئینجا هەر لەم سورەتەدا خوای پەروەردگار پاشان دیسان دەفەرمووێ :ـ

{فَأَنْذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّى ،لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ،الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى ،وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ،الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى} الليل: ١٤ – ١٨

بێ گومان کوفرو بەدرۆخستنەوەی ئایەتەکانی خودا، بەسە بۆ گەورەیی تاوانێک کە پێیەوە بچێتە دۆزەخ، بەلاَم لێرەدا کە ووشەی ((**الأشقى**))ی هێناوە مەبەست پشت هەلْکردن و سەرە ڕۆیێیەکەیەتی لە دوژمنایەتی کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)هەروەکو لەبارەی ئەوکەسەش کە لەقەومی ثەموود[*] هات و ووشترەکەی سەربڕی، دەفەرمووێ :ـ

{إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا} الشمس: ١٢

جا خالی سەرنجراکێش و مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە خوای گەورە هەڕەشەی ئاگری کردووە لە کەسی((لأشقى) بەتایبەتی لەبەرکردەوەکانی، سەرەڕای ئەوەی بێ باوەڕییەکەی بەسیەتی بۆ چوونە دۆزەخ، ئایا چۆن دەبێ کەسێ باوەڕیشی هێنابێ و هەر ئامادەی گوێڕایەلی بەرنامەی خوای نەبێ ؟"

هەروەها خوای گەورە لەبەر گرنگی گوێڕایەلی و مەترسی پشت هەلْکردن فەرموویەتی{ لَّا مَنْ تَوَلَّى وَكَفَرَ ,فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ} **الغاشية:٢٣-٢٤**

هەروەکوو شێخ عبدالرحمن السعدی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ واتە ـ بەلاَم هەرکەسێک پشت بکات لەگوێڕایەلی و کوفر بکات بەخودا، ئەوا خودا سزایەکی توندو بەردەوامی دەدات .

کەواتە ئامانج لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێ)ئەوەیە گوێڕایەلی بکرێن، کە ئەمەش باوەڕی ڕاستەقینەی شوێنکەوتوانیان دەسەلمێنێ کاتێک ووتیان بە پێغەمبەرەکانیان

---

(*) لە هەندی ریوایەتدا هاتووە کەوا ناوی (سالف کوڕی قیدار) یان (قیدار کوری سالف) بووە.

ڕاست دەکەن، هەروەکوو خوای بەرزی بێ هاوتا دەفەرمووێ ـ {وماأَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ} النساء: ٦٤

واتە : هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆئەوە نەبێت کە گوێڕایەڵی بکرێت بەفەرمانی خوا .

خۆ ئەگەر تەنها ووتیان ئێمە باوەڕمان هێناوە و پاشان پشتیان هەڵکردو گوێڕایەڵ نەبوون ئەوا قسەیەکیان کرد کە پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن هەبوو، کە نەیان سەلماند کەواتە باوەڕدار نەبوون، هەروەکو خوای شارەزا دەفەرمووێ ـ {وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ} النور: ٤٧

واتە : دەڵێن بڕوامان هێناوە بە خوداو پێغەمبەرو گوێڕایەڵیمان کردووە، پاشان کۆمەڵێک لەوان پشت هەڵدەکەن و گوێڕایەڵی ناکەن، ئەوانە لەڕاستیدا باوەڕدارنین.

لەبەرئەوەی یاساو بڕیارەکانی شەریعەت لەسەر کردەوە دیارو ڕواڵەتیەکان دەدرێن بۆیە لەجیاکردنەوەی باوەڕدار لەبێ باوەڕ هەرکردارو گوێڕایەڵیە کە پارسەنگ و سەنگی مەحەکن تێیدا، ئینجا ئەگەر بابای کافر بانگەشەی باوەڕداریتی کردو، دووڕووەکانیش هەروەکو پیشەیان سوێندیان خوارد کە موسڵمانن و نیازیان چاکە، ئەگەر هەموو خەڵکیش لافی خۆش وویستنی خوایان لێدا، ئەوا پێیان دەووترێ : ـ{**قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ**} آل عمران: ٣١

واتە: ئەی محمد(ﷺ)پێیان بڵێ : ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش دەوێت دەسا شوێنکەوتەی من و ڕێبازەکەم بن، ئەوکات خوداش ئێوەی خۆش دەوێت و لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت، خودا زۆر لێبوردەو لێخۆشبووە وە زۆر بە بەزەییە. هەم دیسان خودای گەورە گرنگی بوونی ئەم گوێڕایەڵی کردنە لەدروستی باوەڕەکەیان دووپات دەکاتەوە کە دەفەرمووێ : {قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ }آل عمران: ٣٢

واتە : ئەی محمد (ﷺ)دووبارە پێیان بڵێ : گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر(ﷺ)بکەن جا ئەگەر گوێڕایەڵ نەبوون و پشتیان هەڵکرد ئەوا بەڕاستی خودا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت .

ئەمە سەرەنجامی ئەو پشت هەڵکردنەیتیان کە بەهۆیەوە دەچنە ڕیزی بێ باوەڕان چونکە ڕاستی بانگەشەی باوەڕداریێتیان نەسەلماند بۆیە هەرچی چاکەیەکیش کە هەیانبووە پووچ و بەتاڵ دەبێتەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ }محمد: ٣٣

واتە : (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بکەن(ﷺ)و کردەوەکانتان بەتاڵ مەکەنەوە) .

بەڵکو لەمەش زیاتر خوای گەورە سەرفرازی یەکجارەکی کە بریتیە لە ڕزگار بوون لە ئاگری دۆزەخ و چوونە بەهەشت بەستاویەتیەوە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)دوای باوەڕ پێ هێنانی، هەروا پشتیوانی کردن و سەرخستنی، هەروەکو دەفەرمووێ :
{فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ }الأعراف: ١٥٧

واتە : ئەوسا ئەوانەی باوەڕیان هێنا بە محمد (ﷺ)وە ڕێزو حورمەتیان بە گەورە زانی و سەریا خست و شوێن ئەو ڕووناکیەش کەوتن کە لەگەڵیدا دابەزیوە (کە قورئانە) ئەوا هەر ئەوانە سەرفرازو سەرکەوتوون .

لەمەش ووردتر بەڵکوو بناغەو سەرەتای هەموو کارەکان لەوەدایە کە مرۆڤ ڕێنمایی بکرێ لەلایەن خوداو بکەوێتە سەر ڕاستە شەقامەکەی، کە ئەمەش دیسانەوە هەر بەگوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ)بەستراوەتەوە بۆیە ئەم جارە بەشێوازێکی زەقترو ڕاستەوخۆتر فەرمان دەکات بەشوێن کەوتنی پەیامبەرەکەی، هەروەکو دەفەرمووێ :ـ
{فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ }الأعراف: ١٥٨

وە یاخود دەفەرمووێ {قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ} النور: ٥٤

واتە : ((ئەی محمد (ﷺ)پێیان بڵێ : باگوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بکەن، جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوا لەسەر پێغەمبەر ئەو پەیامەیە کەپێی ڕاسپێردراوە، کە بەڕاستی گەیاندوویەتی، وە لەسەرشانی ئێوەشە کە گوێڕایەڵی بکەن جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوا گومراییتان دەرکەوت و شایستە دەبن بۆ سزا، وە ئەگەر گوێڕایەڵیشی بکەن ئەوا ڕێنمایی دەکرێن بۆ ڕێگای ڕاست بە گوفتارو کردار، چونکە هیچ ڕێگاو هۆکارێکتان نیە بۆ گەیشتن بەهیدایەت تەنها بە گوێڕایەڵی کردنی ئەو پێغەمبەرە نەبێ، بەبێ ئەمەش نابێ و مەحاڵە .))[1].

پوختەی ئەم باسەمان بۆ ئەوەبوو بڵێین کە ئایا نهێنی و هۆکاری سەرەکی لەگرنگی گوێڕایەڵی کردنی فەرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ)چیە ؟ بێ گومان ئەوەیە کە فەرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەر(ﷺ)هەمووی هەواڵدان (أخبار)نیە، کە تەنها لەسەرمان پێویست بکا بەڕاستی بزانین واتە (تصدیق) ی بکەین، بەڵکو ڕاستی ئەوەیە کە فەرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەر(ﷺ)بریتین لە هەواڵدان و فەرمانەکان (إخبار و أوامر)، ((ئایا هیچ کەسێکی ژیر دەڵێ : خوای گەورە کە فەرمان بە بەندەکانی دەکات کە (**أقيموا الصلاة**)واتە : نوێژ ئەنجام بدەن، ئایا تەنها داوای ئەوەیان لێ دەکات کە بەدڵ یان زوبانیان بڵێن: ڕاست دەکەی ؟" وە یاخود ئایا کە پێیان دەفەرمووێ (أدعُونی) واتە : لێم بپاڕێنەوە، مەبەستی تەنها ئەوەیە بەندەکان بڵێن: ڕاست دەکەی ؟" وە ئەگەر پێیان بڵێ : (**لاتقربوا الزنا**) واتە : نزیکی داوێن پیسی و زینا مەکەون ، ئەوانیش تەنها بڵێن : ڕاست دەکەی ؟" وە ئەگەر پێیان بڵێن: (**بَلِ**

---

(١) تيسير الكريم الرحمن/للسعدی : ٥٧٢ – ٥٧٣.

**اللَّهَ فَاعْبُدْ**) واتە : تەنها خودا بپەرستە، ئەوانیش تەنها بڵێن : ڕاست دەکەی ؟" کێ ئەم قسەیە دەکا ؟" ))[١].

هەروەها موفتی عێراق (أبو **ثور** الكلبي البغدادي)(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :-(( ئەو کۆمەڵەی پێیان وایە کردەوە بەشێک نیە لەباوەڕ، پێیان دەووترێ : ئایا خودا چی لەبەندەکان دەوێ کاتێ پێی فەرمووندە: نوێژ بکەن و زەکات بدەن، تەنها دان نان ، یان داننان و کردەوە ؟ ئەگەر ووتیان : خودا تەنها داننانی لێیان ویستووە و کردەوەی نەویستووە ؟ئەوا لەلای زانایان ئەوکەسە کافرە کە بڵێ خودا داوای لەبەندەکان نەکردووەو نەیویستووە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، وە ئەگەر ووتیان : داننان و کردەوەی ویستووە لەبەندەکانی، دەڵێین: ئەگەر هەردووکیانی وویستوە بۆ دەڵێن تەنها بەیەکێکیان دەبێتە باوەڕدار ؟ ئایا ئەگەر پیاوێک بلێ : هەموو ئەوشتانەی خودا فەرمانی پێ کردووە جێ بەجێ دەکەم بەلام دانی پێدا نانێم، ئایا دەبێتە باوەڕدار ؟ جا ئەگەر ووتیان نا نەخێر، پێیان دەووترێ : ئەی ئەگەر بڵێ : دان بەهەموو ئەو شتانە دەنێم کە خوا فەرمانی پێکردووە بەلام جێ بەجێیان ناکەم، ئایا دەبێتە باوەڕدار؟ ئەگەر ووتیان بەڵێ، پێیان دەووترێ : جیاوازی چیە، خۆ ئێوە دەڵێن خودا هەردووکیانی لەبەندەکانی وویستووە ...))[٢].

ئینجا ابن تیمیەش (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەسەر ئەم قسانەی أبو **ثور** دەفەرمووێ : ـ (( ئەوەی أبو **ثور** باسی کردووە بەڵگەیە لەسەر پێویستی هەردووکیان، داننان و کردەوە، وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی هەردووکیان لە ئایینن، وە هیچ کەس نابێتە گوێڕایەڵ بۆ خوا، وە شایستەی پاداشتیش نابێ و نابێتە خاوەن هیچ پلەو ناوێکی چاک لەلای خواو پێغەمبەر(ﷺ)تەنها بە هەردووکیان نەبێ.)) [٣]

---

(٢) سەیری مجموع الفتاوی (٣٨٧/٧) بکە.

(١) مجموع الفتاوی (٣٨٨/٧).

(٢) مجموع الفتاوی (٣٨٩/٧).

**سەرنج و سوودێک :ـ**

**لەچەند شوێنێکی قورئانی پیرۆزدا دەبینرێ کە لەبەرامبەر ووشەی (الکفر)، ووشەی (الشکر) هاتووە لەجیاتی ووشەی(الإیمان) ، بە واتای ئەوەی لەو شوێنانەی باسی (کفر) و (شکر) کرابێ، ئەوا (شکر) بەمانای باوەڕ هاتووە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ــ**

{إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا }الإنسان: ٣

**هەروەها دەفەرمووێ:-{إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ }الزمر: ٧**

**خاڵی سەرنجیش ئەوەیە کە پێکهاتەی هەردوو زاراوەی (الشکر) و (الإیمان) لەماناو ناوەڕۆکدا وەک یەک و چوون یەکن، لەوەدا کەهەروەک چۆن باوەڕ بریتیە لەبڕوای هەڵقوڵاوی دڵ و دەربڕینی زوبان و کرداری ئەندامەکانی لەش، بەهەمان شێوەش سوپاسگوزاری (شکر) بریتیە لە دانـان بە خاوەنداریێتی خودا بۆ هەموو بەهرەو بەخششەکان، ئینجا سوپاسکردنی خودا لەسەری و بەکارهێنانی بەهرەو بەخششەکانی لە ڕەزامەندی و گوێڕایەڵی خودا، هەروەکو دەفەرمووێ :ــ**

**{يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِنْ مَحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَاسِيَاتٍ اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ}**سبأ: ١٣

**ئەگەر خوای گەورە بەهرەو نیعمەتێکی بەخشی بەکەسێک، ئەویش بەهی خودای زانی و بەزوبان سوپاسیشی کرد لەسەری، بەڵام ئەگەر ئەم بەهرەو بەخشەی لەکارێک بەکارهێنا کە تووڕەیی و سزای خوای لەسەر بوو، ئایا ئەوکەسە بەسوپاسگوزاری ئەم نیعمەتە دەژمێردرێ ؟ بێ گومان نەخێر، هەمان شێوەش لەبابەتی باوەڕدا هەیە، کە ئەگەر کەسێک لەدڵدا بڕوای بەخودا هەبوو، بەزوبانیش دەری بڕی، بەڵام ئامادەنەبوو هیچ کارێک لەفەرزو پێویست کراوەکانی خودا جێ بەجێ بکا و گوفتارو کردارێکی ئەنجام دا کە پێچەوانەی باوەڕەکەی بوو، ئەوکەسەش بەباوەڕدار ناژمێردرێ، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ : {وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ }لقمان: ١٤**

واتە : ـ (( فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد بەچاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکی، کاتێک دایکی هەڵی گرتووە بەئازار لەسەر ئازار تا پێوەی لاوازو ماندوو دەبێ، ئینجا لەشیر برینەوەی لەدووسالیدا، بۆیە پێمان ووت : کە سوپاسگوزاری خوابە بە بەجێ گەیاندنی مافەکانی و ئەنجام دانی بەندایەتی، وە ئەو نیعمەت و بەهرانەم بەکار نەهێنی لەسەر پێچی کردنم، هەروا دەبێ سوپاسگوزاری دایک و باوکت بکەی بە چاکەکردن لەگەڵیان بەقسەی نەرم و ئاخاوتنی شیرین و کرداری جوان و خۆ بەکەم زانین لە ئاستیان و ڕێزگرتنیان و خزمەتکردن و دابین کردنی پێویستیەکانیان و دوورکەوتنەوە لە ئازاردانیان بە هەموو شێوازێکی گوفتاری و کرداری)) [١].

بۆیە پێویستە بلێ :{ **رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ** }الأحقاف: ١٥

## مانای (**الطاغوت**) و جۆرەکانی

ووشەی (**طاغوت**) لە (**طغیان**) هاتووە واتە سنور بەزاندن یاخود لەسنور دەرچوون، هەروەکو ئیمامی ابن القیم فەرموویەتی : ـ هەرشتێکە کە بەندە پێیەوە لەسنووری خۆی دەردەچێ بۆئەوەی بپەرسترێ یان خەڵک بەدوای بکەون یان گوێڕایەڵی بکرێ[٢] .

کەواتە تاغوتەکان زۆرن بەڵام سەرەکیەکان پێنجن : ـ

١ ـ **شیطان** (لەعنەتی خوای لەسەربێ) کەبەردەوام خەڵکی بانگ دەکات بۆئەوەی شتی تر جگە لەخوا بپەرسترێ، ئینجا ئەگەر خەڵکی گوێڕایەڵیان کرد لەوەدا ئەم وە پەرستیان هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ـ

{أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ} یس: ٦٠

واتە : ئایا پێم ڕانەگەیاندن ئەی نەوەی ئادەم کە شەیتان نەپەرستن چونکە ئەو بەڕاستی بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە.؟

---

(١) سەیری تەفسیری (تیسیر الکریم الرحمن) : ٦٤٨ بکە.

(٢) الاعلام الموقعین ٩٢/١.

**دوژمنێکی ئاشکرایە شەیتانی نەفرەتی**
**گومڕاکردنی مرۆڤ پیشەو مەبەستیەتی**
**بۆچی لەو جەنگە تۆبێ هیممەتی**
**لەپیلانی بێ ئاگای، بەردەوام لێ ی خەوتی**

**٢ــ فەرمانڕەوایەکی خراپەکار کە بڕیارەکانی خوای گەورە دەگۆڕێ:**

بۆ ئەوەی ڕووی خەڵک لەبڕیارێکی تری دەستکردی مرۆڤ بکات یاخود والەخەڵک بکەیەنێ کە بڕیارەکانی خوا بۆ هەموو سەردەم و شوێنێک ناگونجێ. هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی :

{أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا} النساء: ٦٠

واتە : ئایا نەتڕوانیتە ئەو دوو ڕوانەی لافی ئەوە لێدەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی بۆتۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کەپێش تۆ ڕەوانەکراوە(بۆ پێغەمبەران) کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادوگەر و خوانەناسان تا دادوەریان لەنێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوور .

٣ــ ئەو فەرمانڕەوایەی حوکم بەقوڕئان ناکات و حوکم بەشتێکی تردەکات، دەستورو بەرنامەیەکی تری دەستکردی پێ باشترە لە دەستوورو بەرنامەی خوا، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ:ـ

{**وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ**} المائدە: ٤٤

واتە: هەرکەسێک حوکم و دادوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندوە ئا ئەوانە بێباوەڕن.

**٤ ـــ ئەوکەسەی بانگەشەی ئەوە بکات کە شتە پەنهانەکان دەزانێ.**

چونکە (علم الغيب) تەنها لەلای خوای گەورەیە ، هەروەکوو فەرموویەتی {وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ } الأنعام: ٥٩

واتە : کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایەو هەر لای ئەوە، کەس نایانزانێت جگە لەو زاتەی کە هەرچی لە ووشکانیەو لەدەریاکانە پێی دەزانێت و هەر گەڵا دارێک کە دەکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێت، هەروەها دەنکێک یان تۆوێک لە تاریکیەکانی زەویدابێ، جا ئەو دەنکە چ شێداربێ یان ووشک بێت هەمووی لەلای خوا زانراوەو لە (لوح **المحفوظ**) دا تۆمارکراوە. هەروەها لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی :

{إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}لقمان: ٣٤

واتە : بەڕاستی هەرخوا زانیاری ڕوودانی ڕۆژی قیامەتی لەلایەو بارانی بەفەڕو بەرەکەتیش هەر ئەو دەیبارێنێت و دەزانێ چی لە ڕەحمی مێینەکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێت چی بەسەر دێت و چی دەستەدەکەوێت، هیچ کەسیش نازانێت لەسەرچ زەویەک دەمرێت و کۆتایی بەژیانی دێت، بەڕاستی خودا بەهەموو شتێک زانایەو ئاگادارە .

لەئێستاشدا ئەوانەی بانگەشەی زانینی پەنهانەکان دەکەن دوو کۆمەڵن :.

یەکەمیان : فاڵچی و جادوبازەکان کە لەڕێگای خوێندنەوەی فنجان و ناو لەپی دەست و سەیرکردنی ئاوێنەو شتی تر، گیرفانی خەڵکی بەتاڵ دەکەن .

دووەمیـان: ئەسـتێرەناس و کـەلوو نووسـەکان کـە مەبەسـتیان نەهێشتنی بڕوای خەڵکە بەزانست و قەزاو قەدەری خودا .

٥ ـ ئەوکەسەی جگە لەخوا دەپەرسترێ و ڕازیە بەم پەرستنە: ـ

ئینجـا چ لەلایـەن خەڵکـەوە بپەرسـترێ و گوێڕایـەڵی تـەواوی بۆبکرێ ئەویش پێ ی خۆش بێ، یاخود وا لەخەڵک بکات و زۆریان لێ بکات کە مل کەچی ببن و بە گەورەی بـزانن چ لـەڕێگای دەم چەورکردن و تێرکردن، چ لەڕێگای دەم بەستان و سەرکوتکردن . خوای گەورە فەرموویەتی : ـ { وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ } الأنبياء: ٢٩

واتە : هەر یەکێک لە مەلائیکەکان بڵێت منیش جگە لەو خواوەندەم ئـەوا سـزای دەدەیـن بـە دۆزەخ، هـەر بـەم شـێوەیەش سـزای ستەمکارو زۆردارەکان دەدەین .

ئینجا ئەگـەر خودای کردگـارو بـەتوانا لـە مەلائیکـە پـاک و بـەڕێزەکان قـەبوڵ نـەکات کـە ئـەم مافـە بـەخۆیان بـدەن و ئـەم ووتەیـە دەربـڕن چـۆن لـە مرۆڤـە خراپـەکارو گوناهبارەکـان قـەبوڵ دەکات ؟

ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ : ـ ((**الطاغوتُ كُلُّ مُعَظَّم ومتعظِم بغير طاعة الله ورسوله، إنسانٌ أو شيطانٌ أو شيءٌ مِنَ الأوثان**))[١]

واتــە : ((تــاغوت هــەموو کەسـێکە کــە بــە گــەورە دادەنــرێ لەلایـەن خـەڵکی، وەیـان خـۆی بەگـەورە دادەنـێ و دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر خـەڵک دەسـەپێنێ، جـا مرۆڤـ بـێ یـان شـەیتان یـان شـتێک لەبــەردو بتــەکان.)) بــەڵام کاتێــک کــە بڕیــاری خــوا هــات بەسزادانیان، ئەوا نـەخۆیان پـێ ڕزگـار دەکـرێ و نەسـوودێکیش بـە شوێنکەوتووانیان دەگەیەنن .

(١) جامع الرسائل ٢/ ٣٧٣.

{فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ لَّمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ }هود: ١٠١

{إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ} الأعراف: ١٩٤

واتە:ـ ئەوانەی ئێوە جگە لەخوا هاواریان بۆ دەبەن و لێیان دەپاڕێنەوە بەندەو دروستکراون وەکو خۆتان، بانگیان بکەن، با وەڵامتان بدەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن.

چەشنێکی مرۆڤن لەسەدەی بیستی  دەچنە سەرکورسی تۆ دەبێ بووەستی
خاک خاپور ئەکا، پول ئەبا بەخەستی  گەنج بەنج ئەکا، زەوت ئەکا هەستی
بڕیار دەرئەکا، بەگوێرەی ویستی  بەڵێ ی بۆ نەکەی، دوژمنی سەرسەختی
کەڵێ ی قەوما و لەناوچوو تەختی  سەد حاشا ئەکا لەدارو دەستی

شیخ سلیمان کوڕی سەحمان(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ ((ئەم ووشانەی ووتراوە لەبارەی تاغوت بۆ پێویستی دوورکەوتنەوەیە لێ ی، جا خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کەوا دەستگر بە پەت و قوڵفی بەتینی باوەڕ ئەوکەسەیە کە کوفر بەتاغوت دەکات، وە کوفرکردن بە تاغوتی بە پێش باوەڕهێنان بەخودای خستووە، چونکە ڕەنگە کەسێک بانگەشەی باوەڕ بەخودا لێبدات، لەهەمان کاتدا لە تاغوت نزیک بێت، کە بێ گومان لێرەدا بانگەشەکەی دەبێتە درۆ،)) وە کە خوای گەورە فەرموویەتی :ـ

{وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ} النحل: ٣٦

هەواڵی داوە کەوا هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ)ڕەوانەکراون بۆئەوەی خەڵک دووربخەنەوە لەتاغوت، جا

هەرکەسێک لەتاغوت دوور نەکەوتەوە ئەوا سەرپێچی هەموو پێغەمبەرانی کردووە، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ
{وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوها وَأَنابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرى فَبَشِّرْ عِبادِ} الزمر: ١٧

جا لەم ئایەتانەدا بەڵگەی زۆر هەن لەچەندین ڕووەوە لەسەر پێویستی دوورکەوتنەوە لەتاغوت، وە مەبەستیش لە دوورکەوتنەوە چەندشێواز دەگرێتەخۆ کە بریتین لەوەی: ڕقت لیَ ی ببێتەوە، بەدڵ و دەروون، وە دوژمنایەتی بکەی، وە بەزوبان سوک و ناشرینی بکەی، وەبەدەست لایبدەی و لەناوی ببەی لەکاتی بوونی هێزو توانا، وەلیَ ی جیا ببیەوە، جا هەرکەسێک بانگەشەی ئەوەبکات کە لەتاغوت دوورکەوتەوەو ئەم کارانەش نەکات، ئەوا ڕاست ناکات))[1]

جا ئەوەی ئەمڕۆ دەکرێ بەرامبەر ئەم تاغوتانە(لە ڕێزگرتنیان وخۆشویستنیان و سەردان کردنیان و سوێند خواردن بەسەریان و ....هتد ) هەمووی پێچەوانەی باوەڕو پەیامی پێغەمبەرانە(علیهم السلام )هەربۆیە پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ)لەفەرموودەیەکیدا ڕێنماییمان دەکات کەوا سوێند بەتاغوتەکان نەخۆین کەجۆرێکە لە بەگەورە زانینیان هەروەکوو دەفەرمووێ :ـ
(**لا تحلفوا بآبائكم ولا بالطواغي**)[2]

واتە : سوێند مەخۆن بەباوکانتان و هەروا بەتاغوتەکانیش. ئینجا شیخ سلیمان کوڕی سەحمان (ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ)دوای ئەوەی ووتەکانی ابن القیم جێگیر دەکات سەبارەت بەپێناسەی تاغوت و جۆرەکانی، دەفەرمووێ :ـ (***وحاصله أن الطاغوت ثلاثة***

---

(١) الدرر السنيه (١٠/٥٠٢).

(٢) أخرجه مسلم برقم ١٦٤٨.

***أنواع، طاغوت حكم، وطاغوت عبادة، وطاغوت طاعة ومتابعة)*** (١)

واتە : پوختەی قسان ئەوەیە کە تاغوت سێ جۆرە، تاغوت لە فەرمانڕەوایی، وە تاغوتێک لەپەرستندا، وە تاغوتێکیش لەگوێڕایەڵی بۆکردن و شوێن کەوتنی. ئینجا لەهەر ڕۆژگارو سەردەمێکیشدا تاغوتێک یان چەند تاغوتێک هەبوون کەدوژمنایەتی پێغەمبەرانی ئەو سەردەمە، یان باوەڕداران و پیاوچاکانی ئەو سەردەمیان کردووە، هەروەکو خوای گەورە هەواڵی ئەم ڕاستیەی داوە کە دەفەرموویٚ :ـ {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ} الأنعام: ١١٢ هەروەها دەفەرمووێ :ـ { وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ} إبراهيم: ١٣

هەروەها دەفەرمووێ :ـ {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا } الفرقان: ٣١

بەڵام تاغوتانی ئەم سەردەمە هەرسێ شێوازی تاغوتیان لەخۆدا کۆکردۆتەوە بەوەی لەفەرمانڕەوایەتیاندا بەرنامەو بڕیارەکانی خودایان لەکار خستووە و خەڵکیان ناچار کردووە کە گوێڕایەڵیان بکەن و پەیڕەوی یاسا دەستکردو هاوردەکانیان بکەن بەشێوازێک کە دەڵێن یاسا لەسەررووی هەموو کەسێکەو سەرپێچی کردنی سزای توندی بۆدانراوە کە ئەمەش گوێڕایەڵی و پەیڕەوی کردنی ڕەهایە کە دەچێتە چوارچیوەی پەرستن .

لەسەر ئاستی ووڵاتان و جیهانیش، لەئێستادا تاغوت گەلێکی زۆر لە هەموو لاوە بۆ دوژمنایەتی کردن و لەناوبردنی دوا پەیامی ئاسمانی، یەکیان گرتووە (صەهیۆنیەکان و صەفەویەکان وصەلیبیەکان) وە هەوڵەکانیان چڕ کردووە، بە سەرمایەو سامانێکی زەبەلاح خەریکی جێ بەجێ کردنی ئەم پرۆژەیەن هەروەکو دەبینین لەڕووی بیروباوەڕەوە

---

(١) فتاوى الأئمه النجديه (٣٣٧/١).

هەوڵی بڵاوکردنەوەی خاچ پەرستی دەدەن، لەڕووی سیاسی لەجیاتی شەریعەتی خوا، دیموکراسیەت بەسەر وڵاتانی موسڵمان دەچەسپێنن، لەڕووی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری لێشاوێک لەئاکارو هۆکارەکانی بەد رەوشتیان هێناوە، لەڕووی سەربازیش ئەوەی توانیویانە لەداگیرکردنی وڵاتانی موسڵمان، هەروەکو پێغەمبەری خوا ((ﷺ)دەفەرمووێ :(**یوشك أن تتداعى عليكُمُ الأمم كما تتداعى الاكلة على قصعتها**.....) [1]

جا هە ر وە کو بێ باوە ران رازی نابن لە موسولمانان و دە ست لە دوژمنایە تی کردنیان هە لناگرن تا شوین ریبازو ئایینیان نە کە ون، دە بێ باوە ردارانیش فریو نە خۆن بە زۆری ئە وانە ی دە لین(**لااله الا الله**) تاوە کو گەلی تاغوتان رە ت دە کە نە وە و خۆیان بە ری دە کە ن لییان ، هە روە کو پیغە مبە ری پیشە وا ﷺ

فە رمویە تی :-(**من قال لااله الا الله وكفر بما يعبد من دون الله حرم ماله ودمه وحسابه على الله عزوجل**)(٢)

## جۆرەکانی بەتاک و تەنها پەرستنی خودا

## (أنواع التوحيد)

### ١- ناسین و بەتەنها گرتنی خودا لە پەروەردگاریەتی دا (**توحــيد الــربوبيــة**) :-

ناسین و بەتەنها گرتنی خودای بەدیهێنەر لە پەروەردگارێتی دا لەوەدایە کە لەناخی دەروون و باوەڕی دڵمانەوە بۆ چوونێکمان بۆ دروست بێ و پێمان وابێ کەخودا (الله)بەتەنها پەروەردگاری ئەم

(١) **سنن أبي داود عن ثوبان بأسناد صحيح.**

(٢) **رواه مسلم**

بوونەوەرەیە لەبەدیهێنان و ڕۆزی دان و بەڕێوەبردنیدا، هەر ئەو ژیان بەخش و مرێنەرە، سوودو زیان هەمووی بەدەستی ئەوە، هەر خۆیشی بەتەنها وەڵامی نزاو پاڕانەوەی بەندەکانی گیرا دەکات و هەر ئەو لەناخۆشی دا بەهانای لێقەوماو دەچێ.

هەر بیروبۆچوونێکیش پێچەوانەی ئەمە، یان دانانی هاوشێوەو هاوکارێک بۆ خودا لەم دەسەڵاتە، وەیان دانە پاڵی یەکێک یان کۆی ئەم دەسەڵاتە بە کەسێکی تر جگە لەخوا، شیرک و کوفرە بەخودای تاک و تەنها، هەروەکو ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ:- **(أن يجعل لغيرالله تعالى معه تدبيراً ما)** [1].

ئینجا بێ باوەڕانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)لەدانی ئەم دەسەڵاتە بەخودای تاک و تەنها بێ گومان بوون، کەچی لەم سەردەمەی زانست و تەکنەلۆجیایە کافر گەلێک هەن تەنانەت نکوڵی لە بوونی خوداش دەکەن، ڕەنگە زۆریان لە قەناعەت و بڕوای دڵیشیان نەبێ بەڵکو تەنها نکوڵی کردنێکی ستەمکارانەو سەرکەشانەبێ هەروەکو خودای پەروەردگار دەفەرمووێ: {وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا}النمل: ١٤

یان هەندێک لە فەلاسفەکانی کۆن و سەردەم کە بڕوایان وایە ئەم بوونەوەرە ئەزلی یەو هەر هەبووە و هەردەمێنێ کە ئەمەش بێ گومان جۆرێکە لە کوفرو بێ باوەڕی بەخودای گەورە لە پەروەردگاریتی دا چونکە ئەمە پێدانی سیفەتێکی خودایە کە هەرهەبووە بەدروستکراوێکی خودا هەروەکو پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)فەرموویەتی:- {**كان الله ولم يكن شئ غيره، وكان عرشه على الماء**...} أخرجه البخاري وأحمد

واتە:- خودا هەبوو، لەکاتێک جگە لەو هیچ شتێکی تر نەبوو، عەرشەکەشی لەسەر ئاوبوو،

---

(١) أقتضاء الصراط المستقيم ٢/٧٠٣.

هەروەها ڕەتکردنەوە ونکوڵی کردنە لەسیفەتێکی بەرزی خودای بەتوانا کە ئەویش دروستکردن و بەدیهێنانە، خودای پەروەردگار دەفەرمووێ :ـ

{اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ} الزمر: ٦٢

واتە : خودا دروستکاری هەموو شتێکە، هەر خۆیشی ڕاگرو پارێزگارو هەڵسوڕێنەری دروستکراوەکانیەتی .

لەبەر ئەوە زۆرێک لەزانایانی ئیسلام هەڵگری ئەم بیرو باوەڕەیان بەکافر داناوە، لەوانەش : **ابن تيمية و ابن القيم و ابن الحجر الهيتمي و ئیمامی نەوەوی و قاضی عياض و منصور البهوتي** و هی تریش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) .

ئینجا ئەم کەسە با نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێ، هەروەکو **علي بن سلطان الهروي القاري** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ:ـ(**فمن واظب طول عمره على الطاعات والعبادات مع أعتقاد قدم العالم لايكون من أهل القبلة**)[1].

واتە : هەرکەسێک بەدرێژایی تەمەنی بەردەوام بێ لەسەر پەرستن و گوێڕایەڵی کردنی خودا، لەگەڵیشیدا بڕوای بە بێ سەرەتایی جیهان هەبێ ئەوا لەدیندارانی ڕوو لەقیبلە نیە .

دەکرێ مرۆڤی موسڵمان باوەڕی ناخی پتەوتر بکات بەسەیرکردن و تێفکرین لەدروستکراوەکانی کاتێک دەبینی ئەم بوونەوەرە بەم شێوە ڕێک و ئەندازەگیرو بێ کەم و کوڕیە دروستکراوە و هەریەکە لە خولگەو ئاراستەو شوێنی دیاری کراوی خۆی وەگەڕخراوە، هەروەکو خودای بەرزی بەتوانا دەفەرمووێ :ـ

**{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ،الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ**

(١) شرح الفقه الأكبر : ٢٣٠ بە کورتکراوەیی.



**وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ}**

آل عمران: ١٩٠ – ١٩١

**هەروەها دەفەرمووێ :ـ** {وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ} الأنبياء: ٣٣

**هەروەها دەفەرمووێ :ـ** { قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ} العنكبوت: ٢٠

**واتە : پێیان بڵێ : بڕۆن و بگەڕێن بەزەویداو سەیرکەن و بیرکەنەوە لەوەی دەبینن کە چۆن بەدیهاتووە .**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ :**{الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ۖ مَا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِنْ تَفَاوُتٍ ۖ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِنْ فُطُورٍ} **الملك**: ٣

**ڕەحمەتی خوا لەو شاعیرەش کە دەڵێ :ـ**

**كُلُ ما في الكون من بحروبر    لوح تعليم لأرباب النظر**
**أيها المقصود من قول انظروا    كيف في آفاقها لاتنظر[1]**

**واتە :**

**هەرچی لەبوونەوەرە لەدەریاو ووشکایی    تەختەی فێربوونە بۆ خاوەن بینایی**
**ووتەی ((بڕوانن)) بۆ تۆیە نازانی ؟    چۆن والە ئاسۆی فراوانی ناڕوانی**

---

(١) ديوان الاسرار والرموز/١٢٩.

هەروەها شاعیر شەوقی دەڵێ :

تلك الطبيعةُ قف بنا ياساري    حتى أريك بديع صُنعِ الباري
الارضُ حولك والسَّماءُ اهتزَتا    لروائع الايات والاثار
مِن كُلِّ ناطقة الجلال كانها    أمّ الكتاب على لسان القاري
دلَت علَى مَلِكِ الملوك فَلَم تَدَع    لِأدلةِ الفقهاء والاحبار
مَن شكَّ فيهِ فَنَظرةٌ في صُنعِهِ    تمحو عظيم الشك والاثار[1]

واتە :ـ

لەنێو ئەم سروشتە تۆ بمان وەستێنە    تانیشانت دەم بەدیهێنانی خودای بێ وێنە
زەوی لەدەورت ئاسمانیش هەژان    لەبەر جوانی بەڵگەو هەم نیشانەکان
لەهەموو شتێکدا گەورەیی دەردەبڕێ    هەروەکو قورئانێ کە زوبان دەیخوێنێ
بەڵگەن بۆ شای شاهان و نەیهێشتووە    بەڵگە بۆ زاناو ئەوەی تێگەیشتووە
کەسێ گومانی بوو لە دەوری ڕامێنێ    هەرگیز گومان و دوودڵێ نامێنێ

پرسیار / ئایا بێ باوەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)بڕوایان بەخوای گەورە هەبووە ؟

وەڵام / بەڵێ ، بڕوایان بەوەش هەبوو کە خوای گەورە دروستی کردوون هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی :ـ {وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ}الزخرف: ٨٧

واتە :ـ ئەگەر تۆ ئەی محمد (ﷺ)پرسیاریان لێ بکەیت کێ دروستی کردوون ؟

لە وەڵامدا ئەڵێن بێ گومان (**اللّه**) .

لەوەش زیاتر بەڵکو باوەڕیان هەبووە بەوەی ئەم بوونەوەرە خوای گەورە بەدیهێناوە ، هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی :ـ

---

(١) الشوقيات٢/٣٦.

{وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ } الزخرف: ٩

واتــه : ـــ وه ئەگــەر پرسیاریشــیان لــێ بکــەی کــه کــێ ئاســمانەکان و زەوی دروســت کــردووه ؟ ئــەوا دەڵــێن خودایــەکی بەتواناو بەدەسەڵاتی زاناو شارەزا دروستی کردوون .

لــەوەش زیــاتر، بڕوایــان هــەبووه هــەروەکو خــوای گــەوره فەرموویەتی : ـ

{قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ } یونس: ٣١

واته ئەی محمد (ﷺ)بڵێ : کێ ڕزق و ڕۆزیتـان دەدات لەئاسمان و زەویـدا (لـه ئاسـمان بارانتـان بـۆ دەبـارێنێ و لـه زەوی هـەموو جـۆره دانەوێڵەو خۆراکێکتان بۆ دەردەهێنێ) یاخود کێ خاوەنی بیستن و بینینەکانی ئێوەیەو بۆی دروست کـردوون ؟ وه ئایا کـێ زینـدوو لەمردوو دەردەهێنێ (وەکو دەرهێنانی گیایەکی تەڕ لەتۆیەکی ووشــک، هــەروەها وەکــو دەرهێنــانی فەرخــەی باڵنــدەکان لەهێلکــەکانیان، هــەروەها وەکــو بــوونی منــداڵێکی بــڕوادارو موسڵمان لەپیاوێکی کافرو بێ باوەڕ) وه ئایا کـێ مردوو لەزینـدوو دەردەهێنێ (هەروەکو دەرهێنانی هێلکەیەکی بـێ گیـان و مـردوو لــه پەلــەوەرێکی یــان گیانــدارێکی زینــدوو) وه ئایــا کــێ کاروبارەکانی ئاسمان و زەوی و بـەگیان و بـێ گیانـەکان بـەڕێوه دەبات ؟ ئەوانیش یەکسەر پێت دەڵێن (**اَللّه**)

٢ – بەتاک و تەنها پەرستنی خودا له ناوەجوانـەکان و سیفاتـه بەرزەکانی (توحید الأسماء والصفات) : ـ

گرنکـی ئـەم بەشـەش لەوەدایـه کـه بـاوەڕدار نـاتوانی بـەم شێوەیەی خودا شایستەیه پەرستنی بـۆ ئـەنجام بـدات، هـەتا خـودا نەناسێ بەو شێوەیەی کـه شایستەیه بـۆ خـودا، ئەمـەش لـەڕێگای

شارەزاترین کەسان بەخودای گەورە کە پێغەمبەران و پەیامبەرانن(سەلامی خوایان لێ بێ)، هاتن و بەجۆرێک خودایان بەخەڵک ناساند کە خواپەرستانیان گەیاندە پلەیەک لە چاکەکاری و خواپەرستی هەروەک وا خودا دەبینن، خۆ ئەگەر ئەوانیش خودا نەبینن ئەوا هیچ گومانیان نیەو دڵنیان کە لەهەر شوێنێک بن خودا دەیانبینێ و ئاگادارە بەکاروباریان، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)لەباسی پلەی چاکەکاری دا دەفەرمووێ :ـ

**{أن تعبُدَ اللَّهَ كأنَّكَ تراه ، فإن لم تكن تراه فإنهُ يراك}**

ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەش دەچێتە نێو کرۆکی خواپەرستی کەئەویش نزاو پاڕانەوەیە، چونکە بنچینەی خواپەرستی دەرخستنی هەژاری و بێ دەسەڵاتی و کەم و کوڕیە، کە ئەمەش لەپاڕانەوەو نزادا دەبینرێ، خودای گەورە دەفەرمووێ:ـ

{وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا} الأعراف: ١٨٠

واتە : هەر بۆ خوایە هەموو ناوە تەواوو جوانەکانی، جا ئەی باوەڕداران بەو ناوانە نزاو پاڕانەوە و داوای پێداویستیەکانتان لێ ی بکەن .

ئینجا لە بەزەیی فراوانی خۆی، لەبەر پایەی دوعاو نزا لەلای خوای پەروەردگار، بەکارهێنانی ناوەکانی کردۆتە هۆکارێک بۆ ئەنجامدانی ئەم خوا پەرستیە، هەروەکو پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی :ـ (**ليس شيئٌ أكرمَ علَى اللهِ عزَوجلَ مِنَ الدُعاء**) [1].

واتە : هیچ شتێک بەڕێزتر نیە لای خودای گەورە لەنزاو پاڕانەوە .

سەبارەت بەژمارەی ناوەکانی خودای گەورەش کە لەقورئانی پیرۆزو فەرموودە دروستەکانی پێغەمبەر(ﷺ)هاتوون (٩٩)ناون، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)فەرموو یەتی :ـ (**إن لِلَّهِ**

---

(١) **رواه الترمذي (٣٣٦٧) واحمد (٢/٢٣٦٢) وابن ماجة (٣٨٢٩) والبخاري في الأدب المفرد (٧١٢) وصححه ابن حبان (٢٣٩٧) والحاكم (١/٤٩٠) وأقره الذهبي.**

(٢) رواه مسلم

**تسعةٌ وتسعين اِسماً، مائةٌ إلّا واحداً، من أحصاها دخل الجنَة، وهـو وتر يُحِبَ الوتر)** [١]

واتـه :ـ خـوای گـەورە نـەوەدو نـۆ نـاوی هەیـە، سـەد کـەم یـەک، هەرکەسێک لەبەریان بکات (واتە تێیان بگات و لەخۆی و کاری ڕۆژانەی جێ بەجێیان بکات) ئەوا دەچێتە بەهەشت، خودا تاک و تەنهایە و تاکی خۆش دەوێت .

بێ گومان ناوی جوانی تری هەیە، بەڵام لەلای خۆی لەزانستی پەنهاندا (علم الغیب) هێشتوویەتەوە .

هەروەکو لەیەکێ لە نزاکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا هاتووە کە دەیفەرموو ـ (**اللهم إني عبدك وابـن عبـدك وابـن أمتـك، ناصيتي بيدك ماض فيّ حكمك عـدل فيّ قضـاؤك، أسـألك بكـل اسم هو لك سميت بـه نفسـك أو علمتـه أحـداً مـن خلقـك أو أنزلته في كتابك أو استأثرت به في علم الغيب عندك، أن تجعل القرآن ربيع قلبي ونور صدري وجلاء حزني وذهاب همي،**)[٢] .

واتـە:ـ خودایـە مـن بەنـدەی تـۆم کـوڕی بەنـدەی تـۆم، کـوڕی ئـافرەتێکم بەنـدەی تۆیـە، نێوچـەوانم (چـارەنووس و سـەرەنجامی کارم) بەدەستی تۆیە، حوکمی تۆ بەسەرمدا جێ بەجێیە و بڕیارت لەمندا دادگەرانەو بەجێیە، خوایە بەهەموو ناوێک کەناوی تۆیەو ناوت پێ لەخۆت ناوە، یا لەپەرتووکی خۆتدا دادبەزاندووە، یا فێری یەکێک لە دروستکراوەکانی خۆت کردووە، یا لەزانست و زانیاری پەنهانی خۆتدا هەڵت گرتووە، داوات لێ دەکەم کە قورئان بکەیتە شیفاو بەهاری دڵم و ڕووناکی سینەم و ڕەوێنەرەوەی خەم و پەژارەم و لابەری خەفەتەکانم .

ئینجا بیرورای ئەهلی سوننەو جەماعە لەمەڕ ناووسیفاتە بەرزەکانی خودا، باوەڕ هەبوونە بەو وەصفەی خودا (سبحانە

(١) **رواه البخاري ومسلم**.

(٢) **مسلم** ٢٠٤٥/٤.

وتعالى)بۆ خوای کردوویەتی، بەو وەصفەش کە پێغەمبەر (ﷺ)خودای پێ وەصف کردووە بەبێ گۆڕین و لەکارخستن و بێ چۆنیەتی پێ دان و شێوەسازی، هەروەکو ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ــ پێغەمبەران لە یەکەمیان تا کۆتایان (سەلامی خوایان لێ بێ) ڕەوانەکراون تا بانگەوازی بکەن بۆ لای خودا، جا ئەو پەروەردگارە یان بەخەڵکی ناساندووە لەناوو سیفات و کردەوەکانی بەپێناساندنێکی و وردو درێژ، وەک ئەوەی بەندەکان سەیری پەروەردگاریان دەکەن و دەبینن کە لەسەروو ئاسمانەکان لەسەر عەرشەکەیەتی قسە دەکات لەگەڵ مەلائیکەتەکانی، هەروەها کاروباری بوونەوەرو دروست کراوەکانی بەڕێوەدەبات، دەنگی هەموویان دەبیستێ و هەموو کردارو جوڵەکانیانی دەبینێ .... وە ڕەزامەندی هەیەو تووڕە دەبێ، وە خۆش ویستن و ڕق لێ بوونەوەی هەیە،، دەژێنی و دەمرێنی، دەگرێ و دەبەخشێ، لەتاوان خۆش دەبێ و بەڵاو ناخۆشی لادەبا.... ئەمە مەبەستی بانگەواز و کروکی پەیامی پێغەمبەرانە) [1] ..بەتەنها گرتنی خودای گەورەش لەناوو سیفاتە بەرزەکانی بەتاڵ دەبێتەوەو نامێنێ بە هاوبەش دانان و لادان لەمانا ڕاستەقینەکەی ناوەکان (**الشرك والإلحاد في اسمائه**) ئینجا هاوبەش دانان بەواتا لە دروستکراوەکانی کەسێک یان شتێک بکرێتە هاوشێوەی خودای گەورە

لەناوو سیفەتێکی بەڵام لادان لەمانای ناوەکان (**الالحاد في اسمائه**)هەروەکو ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ:ـ چەند جۆرێکە:ـ

یەکەم :ــ ناوێکی خودا لەبتێک بنرێ،هەروەکو ناوی بتەکانیان دەبرد بە (**ألـلات**) کەلە (**الإلـه**) وەریان گرتبوو، وەیان (العُزّى) کە لە (العزيز) وەریان گرتبوو .

---

(١) بەکورتکراوەیی لە مدارج السالكين (٣/٣٤٨ – ٣٤٩).

دووەم :ـ ناولێنان و ناوهێنانی خودا بەناوێکی ناشایستە بۆ خودا، هەروەک نەصرانیەکان ناوی خودا دەهێنن بە (باوک) یاخود فەلاسفەکان ناوی خودا دەهێنن بە (پێویستی بوون بەخۆی) یان (هۆکارێکی بکەر) .

سیٚ یەم :ــ وەصف کردنی خودا بە سیفەتێک کە خودا بەرزوپاک و دوورە لەم کەم و کوڕیانە :ــهەروەکو جولەکە بەدەکان دەیانووت : خودا هەژارە، یان دیانووت ، خودا دوای تەواو بوونی لەدروستکردنی دروستکراوەکانی پشووی داوە (تعالی اللّه).

چوارەم :ـ لەکارخستنی ناوەکان لەماناکان و نکۆڵی کردنی واتا ڕاستەقینەکانی :ـ هەروەکو جەهمیەکان و شوێنکەوتوانی دەیانووت :ـ ناوەکان تەنها چەند زاراوەیەکن و هیچ ماناو سیفەتێک لەخۆناگرن .

پێنجەم :ــ لێک چوواندنی سیفەتەکانی خودا بەسیفەتی دروستکراوەکانی، (**تعالی اللّه عما یقول المشبهون علواً كبیراً**)[1].

ئینجا هەرناوێک لەناوە جوانەکانی خودای پەروەردگار، سیفەتێکی بیٚ کەم و کوڕی و بەرزی خۆیەتی، سیفەتێک کەشایستەو لایەقی ئەوەو دوور لەهەموو ناتەواویەک، هەروەها هاوشێوەو هاو وێنەی نیەو نابیٚ لەنێو دروستکراوەکانی، خوای بەرزی بیٚ هاوتا دەفەرمووێ :{ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ } الشورى: ١١

واتە : هیچ شتێک لەشێوەی ئەو نیەو هاو وێنەی ناکات، ئەو بیسەرو بینایە .

بەڵام هەندێک لە سیفەتەکانی خودا ناوی پیٚ لەخۆی نەناوە بۆیە ناکریٚ بلێین ناوە، بۆ نمونە کاتێک دەفەرمووێ :ـ

{وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ ۖ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ } الأنفال: ٣٠

---

(١) بدائع الفوائد (١/١٩٠-١٩١) بەکورتکراوەیی.

واتـه : بـێ بـاوەڕان پیلانـی خـراپ دادەڕێـژن، خـوداش پیلانیـان بـۆ دادەڕێژێت، بـێ گومان خـودا باشـترینی پـیلان دانەرەکانـه. هـەروەها خودای گەورە دەفەرمووێ: -

{إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا،وَأَكِيدُ كَيْدًا }**الطارق**: ١٥ - ١٦

وەیاخود دەفەرمووێ : {كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ} یوسف: ٧٦

واتە :- بەم شێوەیە پیلانێکی باشمان دانا بۆ یوسف .

هەروەها دەفەرمووێ :- { إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا} الحج: ٣٨

واتـه :- خـودا بـەردەوام بـەرگری دەکـات لەوکەسانەی باوەڕیـان هێناوە .

جـا ئەمانــەو هاوشـێوەی ئەمانــە سـیفاتی بــەرزی خــودان (سـبحانه وتعالی)بــەڵام تــەنها لــە تۆڵــەو بەرامبــەر کردارێکــی ناهــەقی بــێ باوەڕان، یان ستەم و پیلانێکـی شـاراوەیان بـۆ بـاوەڕداران هـاتووە، بۆیـە نـاکرێ ناوێـک لـەم بابەتانـە بدەینــە پـاڵ خـودا کـەخۆی لـەخۆی نەناوە بەڵکو تەنها شێوازێکن لەکردارەکانی، هەنـدێ لـەم ناوانـە تەنها لەناو ڕستەداو لەگەڵ ئەو هۆیەی بۆی بەکارهاتووە دێت وەک :- (المـاکر) و (الکائـد) و (المـدافع) و (المسـتهزئ ) و.........هتـد ، بەڵکو کەس وەک خودا وەسفی خۆی نەکردووە (سبحانه وتعالی).

سبحانک ئەی خودای بەرزی بێ هاوتـــا
غفرانک لەکۆڵێک تاوان و خەتـــــــا
تــقدس اسمک تــۆ بــێ گـەردو پـاکی
تـعـالی جـدک تـۆ بە رزو تاکـــــــــی
لەوەی بەدیت هێناجوان وێنەت کـێشا
زاناو بیرمەندان ئاهـیان بۆ کـــــێشا
خالق و بەدیع تۆی، بەرزی بەتـوانـــــا
بێ وێنەی پێشوو ئـەم بـوونـەت دانـــا
زەویت بۆ مرۆڤ وەک فەرش ڕاخســـت

بەعیلم و تەقدیر پێت بەخشی زۆر شت
بەڕێساو شەریعەت ژیانت بۆ ڕێکخست
تا بتپەرستێ کەسێ بەس تۆی ویست
بەچرپەو خورپەکان بیسەرو زانای
چی شەو داپۆشێ ئەتۆ پێی بینای
گوناهم دەپۆشی، لەتاوانم دەبووری
بێ سنووره ڕەحمەتت عەزیزوغەفوری

ئینجا ئەهلی سوننەو جەماعە هەروەک ئەم سیفەتانە ڕەتدەکەنەوە کە خوای گەورە لەخۆی ڕەتکردۆتەوە، ئەو سیفەتانەش بۆ خوا بڕیار دەدەن کەخوا بۆخۆی بڕیار داوە، بەبێ هاوشێوە بۆ دانان (**تمثیل**)و چۆنیەتی کردنی (**تكییف**)و لەکار خستن (**تعطیل**)و گۆڕین (**تحریف**) ، بەڵکو زانیاری ئێمە لەسەر ناوو سیفاتەکانی هەر ئەوەندەیە کە خۆی هەواڵی پێ داوین لەبارەی خۆی هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ ۚ } **البقرة**: ٢٥٥

ئینجا ئادەمیزاد ئەگەر هەرچەند بزانێ، هێشتا هەر کەم و کوڕی هەیە لەزانستەکەی، ئەوەنیە هیچ نازانێ لەو ڕوحەی کە لەخۆیدایە ؟

{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ ۖ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا } الإسراء: ٨٥

هەربۆیە دەفەرمووێ:ـ {فَلَا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ } النحل: ٧٤

واتە : ((هاوشێوەو هاو وێنە بۆ خودا بڕیار مەدەن، بەوەی بڵێن شێوەی خودا ئەوەو ئەوەیە، یاخود هاوتایەکی بۆ دابنێن لە پەرستنی دا. خودا دەزانێ کە خۆی هیچ هاوشێوەی نیە و بەئێمەشی ڕاگەیاندووە.

کە دەفەرمووێ : ـ {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ} الشورى: ١١

وە دەفەرمووێ :ـ {وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ } الإخلاص: ٤

وە دەفەرمووێ :ـ {هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا } مريم: ٦٥

کەواتە ئەو دەزانێ و ئێوە نازانن )) [١].

بۆ نموونە :ـ لە ڕاڤەی ئایەتی {الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ }**طه**: ٥

یاخود ئایەتی{ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ} الأعراف: ٥٤

شیخ ابن العپیمین(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ {**وأهل السنة والجماعة يؤمنون بأن الله تعالى مستو على عرشه استواءً يليق بجلاله ولا يماثل استواء المخلوقين**}[٢]

واتە :ـ ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان هەیە بەوەی کە خوای گەورە بەرزبۆتەوە بەسەر عەرشەکەی، بەرزبوونەوەیەک کە شایەن و شایستەبێ بە گەورەیی و شکۆمەندیەکەی وە هاوشێوەی بەرزبوونەوەی دروستکراوەکانی نیە .

ئینجا هەر ئەمەشە بەرزی خوای گەورە (**عُلُوَّهُ سُبحانَه**) بەسەر دروستکراوەکانی دەردەخات، کە بۆخۆی بڕیاری داوە، هەروەکو دەفەرمووێ :ـ{ يَا عِيسَىٰ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ }آل عمران: ٥٥

واتە : ئەی عیسا من تۆ دەمرێنم (مردنی خەواندن)[٣] وە بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم .

شیخ عبدالرحمن السعدی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ (**وفي هذه الاية دليل على علو الله تعالى واستوائه على عرشه حقيقة، كما دلت على ذلك النصوص القرانية والأحاديث النبوية التي تلقاها أهل السنة بالقبول والأيمان والتسليم**)[٤].

---

(١) **شرح العقيدة الواسطية** ٣١١.

(٢) شرح العقيدة الواسطية ٣١٧.

(٣) هەروەکو خوای گەورە خەوی بە مردن ناوبردووە کەدەفەرمووێ: {وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ } الأنعام: ٦٠. واتە: هەر ئەو خودایە بەشەو دەتان مرێنێ، ئینجا ئەهلی سوننەو جەماعەش بڕوایان وایە کە عیسا (علیه السلام) زیندووەو نەمردووە .

(٤) تيسير الكريم الرحمن/للسعدي ١٣٢.

واتە : لەم ئایەتەدا بەڵگەو ئاماژە هەیە لەسەر بەرزی خوای گەورە و بەرزبوونەوەی بەسەر عەرشەکەیدا، هەروەکو لەسەر ئەمە دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ئاماژەیان بۆ کردووە کە ئەهلی سوننە باوەڕیان پێی هەیەو مل کەچین .

هەروەها دەقی تر زۆرن لەسەر ئەم بابەتە هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ }**فاطر**: ١٠

وە دەفەرمووێ :ـ {تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ } المعارج: ٤

وە دەفەرمووێ :ـ {أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ }**الملك**: ١٦

هەروەها دەفەرمووێ :ـ{ يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ } النحل: ٥٠

هەروەها چەندین ئایەتی تر .

٣–ناسین و بە تەنهاگرتنی خودای پەروەردگار لەپەرستندا (توحید الألوهیە) :ـ

بریتی یە لە بەتەنها بۆ خودا بوونی هەموو کردەوەکانی بەندەکان، بەوەی هەموو کارە پەرستشەکان تەنها بۆ خودای تەنها ئەنجام بدرێ، ئەمەش بناغەو بنچینەی ئایینە، لەپێناوییدا پێغەمبەران (علیهم السلام)ڕەوانەکراون و پەرتووکەکانیش دابەزێنراون و شمشێرەکانیش هەڵکێشراون .

ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە ئایا ئەم موشریکانە کە بڕوایان بەبوونی خوداو دەسەڵاتی خودا هەبوو، بۆچی پێغەمبەری خودا (ﷺ)جەنگی لە دژیان کردوو خوێنی حەڵاڵ کردوون ؟

لەبەر ئەوەی ئەوکەسەی دان بنێت بەوەی خودا دروستکاریەتی و هەر ئەو ڕزق و ڕۆزی دەدات و کاروباری ژیان و مردنی بەدەستی ئەوە، لەسەری پێویست دەبێ کە هەر ئەو خودایەش بپەرستێ کە خاوەنی ئەم دەسەڵاتەیەو هیچ هاوەڵ و هاوتایەکی بۆ دانەنێت، هەربۆیەش خوای گەورە لەکۆتایی ئەم ئایەتەی کە باس لەدان نانی بێ باوەڕەکان دەکا بە پەروەردگاریەتی خودا، دەفەرمووێ :ـ

{فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ } یونس: ٣١

واتە : ـ دەسا ئەی محمد (ﷺ)پێیان بڵێ : ئایا بۆچی خۆتان ناپارێزن و دوورناکەونەوە لە پەرستنی پەرستراوە پووچ و ناڕەواکانتان، ئەوانەی بەدەستی خۆتان لەدارو بەرد تاشیوتانە؟ بۆیە دەبێ باوەڕدار هەموو کارە پەرستشەکان تەنها بۆ خودا ئەنجام بدات، هەروەکو ڕۆژانە ئەم بەڵێنە لەنوێژەکانماندا دەدەین و دەڵێین : {**إِيَّاكَ نَعْبُدُ**}.

خودایە تەنها تۆ بە پەرستراوی هەق و ڕەوامان دەزانین ، بۆیە تەنها تۆ دەپەرستین .

ئینجا سەرەتای سەرهەڵدان و پەیداوونی بت پەرستی کە هاوشێوە دانانە بۆ خودا لەپەرستنیدا، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر نوح (**علیه السلام**) و دوایی، کاتێک لەسەر شێوەی چەند پیاوچاکێک چەند بت و پەیکەرێکیان دروست کرد ، بەمەبەستی یاد کردنەوەو لەبیرنەکردنیان، پاشان بەگەورە زانران، پاشان پەرستران، لەوەشدا شەیتان شێوازی جۆراوجۆری بەکارهێنا لەگومراکردنی گەل و نەتەوەی زۆر هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ : {وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ } یس: ٦٢

(( هەندێکی تری گومڕاکرد بە دروستکردنی شێوە بۆ مانگ و ئەستێرەکان و پەرستنی، هەروەها دروست کردنی خانوو پەرستگاو هەڵکردنی ئاگر تیایدا بە بەردەوامی، هەروەک خانوێک بۆ ئەم مەبەستە لەسەر یەکێک لەچیاکانی شاری ئەصبەهان دروستکرا، وە دووەم و سێ یەم و چوارەمیش لەشاری صنعاء بەناوی (ئەستێرە زوهرە) کە **عثمانی** کوڕی عفان (ڕەزای خوای لێ بێ) خاپوری کرد ، وە یەکێکی تر لەسەر ناوی (ڕۆژ) قابوس پاشا دروستی کرد لەشاری فەرغانە، بەڵام خەلیفە موعتە صەم تێکی دا ))[١]

---

(١) **صحیح أغاثة اللهفان** ٦٢٦.

ئینجا لەسەردەمی باوکی پێغەمبەران ابراهیم (علیه السلام) ئەم بت پەرستیە زۆرترو بڵاوتربوو، بەتایبەتی صابیئەکان کەبۆ هەر ئەستێرەیەک پەیکەرێکیان تاشی بوو، هەندێکی تر شێوەیان بۆ مەلائیکەتەکان داناو لێیان پاڕانەوە، پاشان نەتەوەی موسا (علیه السلام) کە گوێلکەکەیان پەرست، ئینجا کە عیسای کوڕی مەریەم (علیه السلام) هات ئەویان پەرست، لەدوای بەرزبوونەوەشی تا ئێستاش خاچ دەپەرستن، لە دوورگەی عەرەبیش یەکەم کەس کە بت پەرستی هێنا ئەم ناوچەیە عەمری کوڕی لوحەی بوو،

کە پێغەمبەر (ﷺ)لەبارەیەوە دەفەرمووێ :ـ (**رأيتُ عمرو بن عامر بن لُحَي الخزاعي يَجُرُّ قُصبَهُ في النار، وكان أوَلُ مَن سَيَبَ السوائب** )[1].

واتە :ـ عەمری کوڕی عامری کوڕی لوحەی خوزاعی بینی لەناو ئاگر ڕیخۆڵەو هەناوی خۆی ڕا ئەکێشا، ئەو یەکەم کەس بوو کە بڕیارو ڕێسایەکی دانا لە حەرام کردنی ئەو ووشترانە کە پێیان دەووترا (**سائبة**) .

---

(١) **رواه البخاري** (٣٥٢١) **ومسلم** (٧٠٥٢).

## ماناى پەرستن (العبادە) و جۆرەكانى

دواى ئەوەى زانیمان كە پەرستنى خودا ئەو مەبەستە پیرۆزەیە كە لەپێناویدا خوداى گەورە ئەم ئادەمیزادو جنۆكەیەى دروست كردووەو بۆ ئەنجامدانى ئەم ئەركە، هەرچى لەم بوونەوەرەیە بۆ مرۆڤى فەراهەم و مەیسەر كردووە، جا كەواتە دەبێ بزانین پەرستن چى یەو چۆن ئەنجام دەدرێ ؟ ، بەشێوازێك كە خوداى گەورە پێ ى ڕازى دەبێ .

زانایانیش لەپێناسى (العبادە) فەرموویانە :ـ (**هي اسم جامعٌ لكُلّ ما يُحبه اللهُ ويرضاه من الأقوال والأعمال الظاهرة والباطنة مع كمال الحبِّ والذُل لِلَه تعالى**.)[1]

واتە :ـ ناوێكە هەموو شتێك دەگرێتەوە كەخودا پێى ى خۆشەو پێى ڕازیە لەهەموو گوفتارو كردارێكى ڕواڵەتى و دەروونى لەگەڵ تەواوى خۆشەویستى و مل كەچى بۆ خوداى گەورە .

كەواتە بەشێوەیەكى سەرەكى پەرستن دووبەشە :ـ

یەكەم :ـ دەروونى (**باطنى**) :ـ واتە ئەو خواپەرستیانەى بەدڵ ئەنجام دەدرێت و تەنها خودا پێى دەزانێت و لێ ى شارەزاو بەئاگایە، وەكو بوونى بیروباوەڕێكى ڕاستەقینە بەخودا، خۆشویستنى خواو پێغەمبەرى خوا (ﷺ)، ترسان لەخوا (**الخوف أو الخشية**) ، نیازى پاك و خودا پێ مەبەست بوون (**الأخلاص**) ، ئارامگرتن (**الصبر**)، ستایش كردن (**الحمد**)، هەستكردن بەچاودێرى خودا بەسەرت (المراقبە) ، ڕەزامەندى لەسەر قەزاو قەدەرەكانى (**الرضا بالقدر**)، وابەستەبوونى دڵ بەخوا (**التوكل**) ، ئومێد هەبوون بە بەزەیى و لێبوردنى خودا (**الرجاء**) ، ترسان لەسزاو تۆڵەى خودا(**الشفقة**) هەروەكو خودا (عزوجل) لەباسى ڕەوشت و ئاكارى نوێژخوێناندا دەفەرمووێ : {وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ } المعارج: ٢٧

---

(١) رسالة العبودية في المجموع الفتاوي (١٠/١٤٩).

هەڵبەت کارە پەرستشەکان فەرزو فەرمان پێکراوەکان مەبەستە بە پلەی یەک ئینجا سوننەتەکانیش دەگریتەوە، هەروەکوو لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێ :ـ ( ... **وما تقرَبَ إليَ عبدي بشيء أحبَ إليَ مِمَا افترضتُ عليهِ، وما يزالُ عَبدي يتقرَبُ إليَ بالنوافِلَ حَتَى أحِبَه....)**[١].

واتە :ـ بەندەکەم بەهیچ شتێک لێم نزیک نابێتەوە کە لەلام خۆشەویست بێ بە ئەندازەی ئەو شتانەی لەسەریم پێویست کردووە، بەردەوام بەندەکەم بەئەنجامدانی زیادەی چاکەو سوننەتەکان لێم نزیک دەبیتەوە تا خۆشم دەوێت.

ئینجا لەو کارە پەرستشانەش کە فەرزو پێویستن و بەدڵ و دەروون ئەنجام دەدرێ وەک ترسان لەخوای پەروەردگار هەروەک دەفەرمووێ:ـ

{وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ } المائدە: ٥٧

هەروەها خۆش ویستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)هەروەکو دەفەرمووێ: (**فَوَالذي نفسي بيده لايؤمن أحدَكُم حتى أكون أحب إليه مِن والدِه وَوَلدِهِ**) [٢]

واتە :ـ سوێند بەو خودایەی گیانی منی بەدەستە هەر یەکێک لەئێوە باوەڕی نیە تا منی لەلاخۆشەویستر نەبێ لەباوکی منداڵەکانی .

دووەم :ـ ڕواڵەتی (**ظاهري**) . واتە ئەو عیباداتانەی بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێن و شاراوەنین لەخەڵکی .

وەکوو :ـ نوێژکردن، زەکات دان ، بەرۆژووبوون، حەج کردن، ڕاستگۆیی، ئەمانەت پاراستن، چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک، سەردان کردنی خزم و کەس و کار، سەردان کردنی نەخۆش، ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەی مردوو، فەرمان کردن بەچاکە، ڕێگری کردن لەخراپە، جیهادو کۆشش کردن لەدژی بێ باوەڕو دوو ڕووان، چاکە کردن لەگەڵ دراوسێ و هەژارو یەتیم و خەڵکی

---

(١) رواه البخاري عن أبي هريرة.

(٢) رواه البخاري عن ابي هريرة، (كتاب الايمان)

بەگشتی ، بە بەزەیی جولانەوە لەگەڵ ئاژەڵ و گیانلەبەران، نزاو پاڕانەوە، زیکرو یادکردنی خوای گەورە، خوێندنەوەی قورئان، ئیش کردن و کەسابەتی حەڵاڵ ....... هی تر )

بەڵام دەبێ ئاگاداربین کە هیچ کردەوەیەک لەم کردەوانەی دەروونی و ڕواڵەتی وەرناگیرێ لەلایەن خوای گەورە تاوەکو دوو مەرجی تێدانەبێ کە بریتین لە :ــ

یەکەم :ــ خوا پێ مەبەست بوون : واتە دەبێ لەهەموو کردەوەکان تەنها مەبەستت ڕەزامەندی خواو وەرگرتنی پاداشت لەو بێت .

دووەم :ـ پەیڕەو کردنی ڕێنمایی و ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ). واتە هیچ کارێک بەلێکدانەوەی بیری خۆت و باش زانینی خۆت نەکەی، هیچ زیادەو داهێنراوێک لە پەرستنەکاندا ئەنجام نەدەیت، هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی :ــ

{قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا}
الكهف: ١١٠

واتە :ــ جا هەرکەسێک ئومێد دەخوازێ بگاتە دیداری پەروەردگاری با کردەوەی چاک و بڕیار دراو بەپێی شەرع ئەنجام بدات و با هیچ کەسێک نەکاتە هاوبەشی خوا لە پەرستنی خوادا (سبحانە وتعالى) .

کەواتە دەبێ هەموو کارێکی پەرستن، بگرە ژیان و مردنیش دەبێ بۆ خوابێت، بۆ خوا بژی، لە خزمەتی ڕێبازەکەی بژی، لەپێناو خواش بمری، هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی :ــ

{قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيايَ وَمَماتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ ، لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ} الانعام ١٦٢-١٦٣

# بەشی دووەم

## مەرجەکانی ((لا إلَــهَ إلا اللّه))

یەکەم: زانیاری ((العلم))

دووەم: بێ گومانی ((الیقین))

سێیەم: ڕەزامەندبوون ((القبول))

چوارەم: مل کەچ بوون ((الأنقیاد))

پێنجەم: ڕاستگۆیی ((الصدق))

شەشەم: خوا پێ مەبەست بوون ((الأخلاص))

حەوتەم خۆشویستن ((المحبًە))

هەشتەم: مردن لەسەری ((الموت علیە))

# مەرجەکانی لا إلَــهَ إلا اللّه

پرسیار/ ئایا دەبێ چی بکەین تاوەکو ووتنی ((**لَـا إلَـهَ إلّـا اللّـه**)) لێمان قبوڵبکرێ و لە پەیڕەوی کردنیدا پاداشتمان دەست کەوێت ؟

وەڵام /دەبێ بزانین مەرجەکانی قەبوڵ بوونی چین تا لەخۆمانی بهێنینە جێ، چونکە ((**لَا إلَهَ إلّا اللّه**)) پێش ئەوەی بەسەر زوباندا بێت دەبێ هەڵقوڵاوی بیروباوەڕێکی ڕاست بێ کە لەدڵ و دەرووندا جێگیر بووبێ و ئۆقرەی گرتبێ، دەبێ کلیلی کرانەوەی دڵ بێت ئەنجا دەبێتە کلیلی کردنەوەی دەرگای بەهەشت، هەروەکو لەفەرموودەدا هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی :-

(**لَا إلَهَ إلّا اللّه مفتاح الجنة**)[1].

واتە :- **لا إلَــهَ إلا اللّه** کلیلی بەهەشتە .

هەروەها فەرموویەتی:- ( **من قال لَا إلَهَ إلّا اللّه دخل الجنة** )[2]

واتە : هەرکەسێک بڵێ (**لَا إلَهَ إلّا اللّه**) دەچێتە بەهەشت .

(پرسیاریان کرد لە وەهبی کوڕی مونبیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)کە ئایا (**لَا إلَهَ إلّا اللّه**)کلیلی بەهەشت نیە ؟ فەرمووی بەڵێ ، بەڵام ئایا هەموو کلیلێک ددانی نیە ؟ جا ئەگەر کلیل ددانی هەبوون ئەوا دەرگاکەت بۆ دەکاتەوە، خۆ ئەگەر ددانی نەبوو ئەوا بێ گومان دەرگات بۆ ناکرێتەوە )[3].

ئینجا هەروەکو لەدوا ڕۆژ (**لَا إلَـهَ إلّـا اللّـه**) کلیلە بۆ چوونە ناو بەهەشت و بەختەوەریەکی نەبڕاوە، لەدونیاشدا (**لَـا إلَـهَ إلّـا اللّـه**) کلیلە بۆ چوونە نێو ئایینی ئیسلام کە زامن و مسۆگەرکاری

---

(١) **فتح الباري،٣/١٠٩**

(٢) **رواه ابن حبان في صحيحه ٣/١.**

(٣)**أخرجه البخاري تعليقاً في كتاب الجنائز.**

ژیانێکی پڕمانا و خۆشگوزارە، بۆیە دەبێ (**لَا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـه**) بناغەی گۆڕانکاری دەروون و گوفتارو کرداربێ، ئینجا سوودی بۆ بێژەرەکەی دەبێ، بۆئەمەش پێویستە مەرجەکانی بزانین و لەخۆمانی بەرجەستە بکەین :-

یەکەم :- العلم (زانیاری)

واتە : زانین و شارەزابوون لەماناو واتای (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**) ، بە هەردوو بەشەکەی، کە یەکەمیان : ڕەتکردنەوەی (**نفي**) بەخوازانین و پەرستراوێتی لە هەموو کەسێک و شتێک، کە دەکرێتە هاوبەش (**نـد**) یان هاوشێوە (**مـثيل**) یان هاوتا(**نظـير**) ی خوای گەورە، دووەمیان : بڕیاردان و بەشایستە دانانی خودای تەنها، لەوەی پەرستراوی هەقە بەتەنها . بەڵگەی ئەم مەرجەش لەقورئانی پیرۆزدا ئەوەیە کە خودای گەورە فەرموویەتی:- {**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ** } محمد: ١٩

واتە : بزانە کەهیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە تەنها **اللّـه** .

هەروەها فەرموویەتی:- { **إِلا مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ** } الزخرف: ٨٦

واتە : تەنها ئەوانەی شایەتمانی بە هەق دەدەن و دەزانن بە دڵەکانیان کە بەزمانیان چیان ووتووە .

هەروەها بەڵگەش لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)کە فەرموویەتی :- (**مَن ماتَ وَهُوَ يَعلَمُ أَنـهُ لَـا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـه دخل الجنة**) أخرجه مسلم

واتە : هەرکەسێک بمرێت و بزانێت کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لەخوا ئەوا دەچێتە بەهەشت .

کەواتە زانست و زانیاری هەبوون بە (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**) وە بە ئاینی ئیسلام بەگشتی زۆر گرنگە چونکە بەزانست و زانیاری خودای ڕاستەقینە (**اللَّه**) جیا دەکەیتەوە لەخوا درۆیینەکان و ڕێبازە خوارو چەوتەکان، بەزانیاری دەتوانی حەڵاڵ و حەرام لێک جیا بکەیتەوە، بە زانیاری دەتوانی بگەیە ئەوشتانەی خوای گەورە خۆشی دەوێن، کەچی زۆربەی خەڵکی زانیاریان لە ئاینەکەیان نیە بۆیە لەکاتێکدا کە دەبینی بەزوبان دەڵێن (**لَا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـه**) کەچی بەکردەوە لەژیانی ڕۆژانەیان شتی ترو خوای تر بەناهەق دەپەرستن و ئاگاشیان لێ نیە. ئیمامی احمد دەفەرمووێ:ـ (**الناس الى العلم أحوج منهم الى الطعام والشراب**)[1]..

واتە : خەڵکی لەخواردن و خواردنەوە زیاتر پێویستیان بەزانست هەیە.

دووەم : الیقین (بێ دوو دڵی و بێ گومانی)

واتە : دڵت ئارام بگرێ بەو باوەڕە ڕاستەقینەی کە هەتەو هیچ گومان و دوودڵیەکی تێدانەبێ . بەڵگەی ئایەتیش لەسەر ئەم مەرجە هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی :ـ {الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ، وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ} **البقرة**: ٣ - ٤

واتە : ئەوانەی بڕوایان بە پەنهانەکان هەیە (وەکو خواو ڕۆژی دوایی و مەلائیکەتەکان)و نوێژەکان بەباشترین شێوە ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزیەش کە پێمان بەخشیون دەیبەخشن ﷺ وە

---

(١) مدارج السالكين/ الجزء الثاني.

ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بەو قورئانەی بۆتۆ دابەزیوە و ئەو پەرتووکانەش کە پێش تۆ بۆ پێغەمبەران دابەزیوە، ئەوان بەڕۆژی دوایی دڵ ساغ و باوەڕدارن و گومانیان نیە.

هەروەها بەڵگەی فەرموودەش پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی :- **(أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله لا يلقى اللهَ بِهِمَا عَبدٌ غَيرَ شاكٍ فيهما إلا دَخَلَ الجنة)**[1].

واتە : شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە اللهوە منیش نێردراوی خوام ، هەر بەندەیەک بەم شایەتمانە بگاتەوە لای خوا وە هیچ گومانی لێیان نەبێ ئیلا دەچێتە بەهەشت.

**سێ یەم: القبول (وەرگرتن و پێ ڕازی بوون – ڕەزامەندی)**

واتە : هەموو مانایەک و هەموو فەرمان و قەدەغەکراوەکانی کە (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**) لەخۆی دەگرێ وەری بگری و پێی ڕازی بی . چونکە ئەگەر (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**) تەنها ووتن بوایە بە زوبان ئەوا قوڕەیش و بێ باوەڕان قەبوڵیان دەکرد ، بەڵام ئەوان دەیانزانی کە ئەم ووشەیە مانایەکی زۆر لەخۆی دەگرێ بۆیە وەریان نەدەگرت و پێی ڕازی نەبوون و شەڕو جەنگیان لەدژی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)ڕاگەیاند ،

ئەوان دەیانزانی ڕازی بوون بەم ووشەیە واتە گۆڕانکاری تەواو بەسەر هەموو ژیانیاندا دەبێ بکرێ . هەربۆیەش تاغوت و بێ باوەڕان لەئێستاشداو لە هەموو شوێنێکی ئەم زەویەدا هیچ ڕێگریەک ناکەن لە ووتنی ئەم ووشەیە تەنها بەسەر زوبان وەکو دەروێشەکان، بەڵام کە باس لەماناو کارپێکردنی بکرێ ئەوا بەهیچ شێوەیەک ڕازی نابن و هەموو هەوڵێک دەدەن و هەمووماڵیان سەرف دەکەن لەپێناو ڕێگرتن لەم ووشەیەو هەڵگرانی ئەم

---

(١) رواه مسلم.

ووشـەیە و ئامادەنین مل کەچی بەرنامەی خـوابن هـەروەکو خـوای گەورە فەرموویەتی :ـ

{ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ } الصافات: ٣٥

واتە :ـ بەڕاستی ئەوان حاڵیان وابوو کاتێک پێیان بووترایە هیچ پەرستراوێک بەهەق شایستەی پەرستن نیە جگە لە (**اللّـه**) خۆیان بە گەورە دەزانی و مل کەچی پەرستنی خوا نەدەبوون .

**چوارەم : الانقیاد (مل کەچ بوون) .**

واتـە : مل داهێنـان و مل کـەچ بـوون و گوێڕایـەڵی بـۆ هـەموو ئـەو مانایانەی ووشەی (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه**) لەخۆی دەگرێ .

هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی:-{**وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ**} الزمر: ٥٤

واتە : ئێوە بگەڕێنەوە لای پەروەردگارتان و مل کەچ بن بۆی .

{وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ } لقمان: ٢٢

واتــە : هەرکەسـێک ڕووی خـۆی کـەچ بکـات بـۆ خـودا، وە ئەوکەسـە چـاکەکاربێت ئـەوا دەسـتی گرتـووە بـە دامـەزراوترین بیروباوەڕ کە (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه**) یە .

ئینجا نیشانەکانی مل کەچ بوون بـۆ خـودا بریتیـە لەئەنجامدانی هەموو عیبادەت و پەرستنێک بۆ خـودا، وەکـو کڕنـووش بـردن تـەنها بـۆ خـودا، خـۆ چـەماندنەوە تـەنها بـۆ خـودا، قوربـانی کـردن تـەنها لەپێناو خودا، سوێند خواردن تەنها بەخودا، تەواف کردن و سوڕانەوە تەنها بەدەوری ماڵی خوا، خۆشویستنی تەنها بەندەچاکەکانی خـواو تەنها لەبەر خوا، ڕق لێ بوونەوە لەدوژمنانی خواو تەنها لەبەر خوا،

ترسان تەنها لەخوا ،پشت بەستان تەنها بەخوا ، داوای یارمەتی کردن تەنها لەخوا ، دادوەری کردن تەنها بەشەریعەتی خوا ،

گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، شوێن کەوتن و لاسایی کردنەوەی تەنها پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، ڕەزامەندی تەنها بەبڕیاری خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا } النساء: ٦٥

واتە :ـ سوێند بە پەروەردگارت (ئەی محمد (ﷺ)) باوەڕ ناهێنن تاوەکو تۆ نەکەنە دادوەر لەهەموو کێشەکانی نێوانیان پاشان هیچ شتێکیش لەدەروون و ناخیان نەبێ بەرامبەر بڕیارەکەت وە بەتەواوی تەسلیم و مل کەچ ببن .

**ابن كثير** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی :

(**يُقسِمُ تعالى بنفسه الكريمة المقدسة أنه لايؤمن أحدٌ حتى يُحكمَ الرسول (ﷺ)في جميع الأمور، فما حكم به فهو الحَقُ الذي يجب الأنقياد له ظاهراً وباطناً**)[1].

واتە :ـ خوای گەورە سوێند دەخوات بەنەفسی بەڕێزو پیرۆزی خۆی کەوا هیچ کەسێک باوەڕ ناهێنێت تاوەکو پێغەمبەر (ﷺ)نەکاتە دادوەرو بڕیار دەر لە هەموو کاروبارێک ، جا هەربڕیارێک بدا ئەوا هەق و ڕاستیەکە کە پێویستە مل کەچی بێت بەڕواڵەت و بەدڵ و دەروون .

(١) تفسير ابن كثير (٢١١/٢).

هەروەها ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)لەبارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی :ـ (خودای بەرزی بێ وێنە سوێندی خواردووە بە نەفسی پیرۆزو پاکی سوێندێک کە بەدڵنیایی و لەپێشداش بە ڕەتکردنەوە لەسەر ئەوەی کە خەڵک باوەڕیان نیە هەتاوەکو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)نەکەنە دادوەروبڕیاردەر لەهەموو ئەو شتانەی ناکۆکیان هەیە تێیدا لەبنچینەکان و لقەلاوەکیەکان، هەروا لەبڕیارەکانی شەریعەت سەبارەت بەدونیاو دوارۆژ، ئینجا هێشتا بەم دادوەری کردنەش باوەڕیان ناچەسپێ هەتا هیچ دڵتەنگی یەکیان لێ ی نامێنێ و سینەیان بەتەواوی بۆ بڕیارەکەی دەکرێتەوە و قەبوڵی دەکەن، هێشتا بەمەش باوەڕیان ناچەسپێ تاوەکو لەبەرامبەر بڕیارەکەی پێغەمبەردا (ﷺ)تەواو ڕەزامەندی و مل کەچی نەنوێنن و هیچ بەرهەڵستی و نکوڵیەکیان تێیدا نەمێنێ) [1]..

ئینجا لەم ئایەتە پیرۆزانە تێدەگەین کەوا پەیڕەوکردنی بەرنامەی خودا (سبحانه وتعالى)لەباوەڕە، چونکە خودای گەورە ئەم پەیڕەوی کردنەی داناوە بەباوەڕ کە دەفەرمووێ: {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمً} النساء: ٦٥

ابن حزم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ خودای گەورە پەیڕەوکردنی بڕیاری پێغەمبەری (ﷺ)ناوناوە باوەڕ، هەواڵیشی داوە کە بەمە نەبێ باوەڕ نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ هیچ دڵتەنگیەک دروست بێ لەبڕیارەکەی، کەواتە بەدڵنیاییەوە باوەڕ بریتیە لەکردارو نیەت و گوفتار، چونکە پەیڕەوی کردن

(١)التبيان في أقسام القران : ٢٧٠.

کرداره، ئەویش نابێ بەبێ گوفتار، لەگەڵ ئەوەش نەبوونی دڵتەنگی کە ئەویش نیەته[١]..

جائەمەش شتێک نیە کە خەڵک تێیدا سەرپشک بن، یاخود لەکاروباری ئاییندا بچنە ژێر بریارەکان و لەکاروباری دونیایان خۆیان بخزێننە ژێر یاساو رێسا دەستکردەکانی زەوی، هەروەکو شیخ الاسلام ابن تیمیه (رەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ : - هەرکەسێک دەرچێ لەرێبازو بەرنامەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەوا خودا سوێندی خواردووه بە نەفسی پاکی کەوا باوەڕی نیە تاوەکو رازی دەبێ بەبریاری پێغەمبەری خوا (ﷺ)لە هەموو کاروبارێکی ئایینی و دونیاییان کە ناکۆکیان تێیدا هەبووه، تاوەکو هیچ دڵتەنگ بوونێکیش نامێنێ لە دڵەکانیان بەرامبەر بریارەکەی پێغەمبەر (ﷺ)[٢].

رەحمەتی خودا لە ابن القیم بێت کە فەرموویەتی :-

والله ماخَوفي من الذنوب فإنها لعلى طريق العَفو والغُفرانِ
لكنما أخشى إنسلاخَ القَلبِ تحكيم هذا الوحي عَن وَالقرانِ
ورضىً باراء الرجال لاكان ذاك بِمنَة وخرصِها الرحمنِ[٢]

دوواجار لە ووتەیەکی پوختدا ابن القیم (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :-

---

(١) نواقص الأيمان القولية والعملية :٢٩٩.

(٢) مجموع الفتاوى ٤٧١/٢٨.

(٢) التبيان في اقسام القران ٤٣

(**والتصديق ب((لا إله إلّا اللّه)) يقتضي الإذعان والإقرار بحقوقها وهي شرائع الاسلام التي هي تفصيل هذه الكلمة، بالتصديق بجميع أخباره وامتثال أوامره واجتناب نواهيه .. فالمصدق بها في الحقيقة هو الذي يأتي بذلك كله، ومعلوم أن عصمة المال والدم على الاطلاق لم تحصل إلا بها وبالقيام بحقها، وكذلك النجاة من العذاب على الأطلاق لم تحصل إلا بها وبحقها** .) [٢].

واتە :ـ بەڕاست زانینی (**لا إلـه إلّـا اللّه**) پێویست دەکات بە مل کەچ بوون و دان نانی بە ئەرک و پێویستیەکانی کە بریتیە لە ئەو دروشمانەی وەک (ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژوو، زەکات دان و حەج و هی تر...) کە ووردەکاری ئەم ووشەیەن، بەوەی هەموو هەواڵەکانی بەڕاست بزانی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بی و دووربکەویەوە لە قەدەغەکراوەکانی جا لەڕاستیدا بەڕاست زان ئەوکەسەیە کە ئەمانە هەمووی جێ بەجێ دەکات،

شتێکی زانراویشە کەوا پاراستنی ماڵ و خوێن بەرەهایی بەمە نەبێت بەدەست نایەت کە دەبێ ئەرکەکانی ئەنجام بدرێ، هەروەها ڕزگاربوونیش لەسزا بەرەهایی بەمە نەبێ بەدەست نایەت.

کەواتە باوەڕدار پێویستە لەگەڵ خودای پەروەردگارو پەیامە پیرۆزەکەی ئەوپەڕی ئەدەب و خووڕەوشتی بەرز بنوێنێ، کە ئەویش بریتی یە لەوەرگرتنی هەواڵەکانی بە باوەڕپێ هەبوون و بەڕاست زانینی، وە وەرگرتنی بڕیارەکانی بە مل کەچی و گوێڕایەڵی کردنی، وە وەرگرتنی قەدەرەکانی بەڕەزامەندی و ئارام گرتن لەسەری .

| | |
|---|---|
| مرۆڤـــی ژێـــر ســـەرنج دە | لەبـــەهرەی ئـــەم خودایـــە |
| تـــەنهایی بـــۆ خۆیـــەتی | بـــەتۆش دڵێکـــی بەخشـــایە |
| بـــاوەڕە قســـــەوکردار | تـــەنهاش بـــۆ ئـــەو ڕەوایـــە |
| لـــەدونیا بەختـــەوەری و | بەهەشـــتیش تـــا هەتایـــە |
| مرۆڤـــی ژێـــر ســـەرنج دە | لـــەخۆت و ئـــەرزو ئاســـمان |

| | |
|---|---|
| لـــەکوێ هـــاتی و بۆهـــاتی | بۆســـەر دونیـــاو ژیـــن و مـــان |
| تـــۆ خەلیفـــەی بـــەڕێزی | نـــەک بەنـدەی پـول و سـامان |
| دونیـــا بـــەدین ئاواکـــەو | بـــۆ دوا ڕۆژ چـــاکەو ئیمـــان |
| تـۆ لـەخاکی و بـۆ نێوخاکـە | ســـــەرەنجامی تەمـــــەنت |
| هــەردەم بــا لــەیادت بــێ | حەقیقەتــــــە مردنــــــت |
| گەنجینەیـــە ، دەســـتکەوتە | هـــزرو بـــڕواو بۆچـــونت |
| کڕنـــۆش ببـــە بـــۆ خـــوداو | مـل کـەچ کـە بـۆی گـەردنت |

هــەروەها بەڵگــەش لەفــەرموودەی پێغەمبــەر (ﷺ)ئەوەیــە کــە دەفەرمووێ :ـ (**كُلُ أمَتي يدخلون الجَنَة إلَا مـن أبـى، قـالُوا : يـا رسول اللّه وَمَن يأبى ؟ قـال: مـن أطـاعني دخـل الجنـة، ومـن عصاني فقد أبى**) [1]

واتــە : هــەموو ئوممەتەکــەم دەچـنە بەهەشـت تـەنها ئەوکەسـە نـەبێ کـە نەیـەوێ بچـێتە بەهەشـت، هاوەڵـان فەرموویان:ـ جـا کـێ هەیە نەیەوێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟

فـەرمووی : ئـەوەی گوێڕایـەڵیم بکـات ئـەوا دەچـێتە بەهەشـت، ئەوکەســەش کــە سەرپێچــیم بکــات ئــەوا نەیویســتووە بچــێتە بەهەشت.

**پێنجەم : الصدق (ڕاستگۆیی) .**

واتە ڕاستگۆیی لەووتنی (**لَا إلَهَ إلَّا اللّه**) بەشێوەیەک کـە ئـەوەی دەیلێی هەڵقوڵاوی دڵ و دەروونت بێت، بـەم ڕاسـتگۆییەش بـاوەڕدار لـە دووڕوو جیا دەبێتـەوە چونکە دووڕووەکان لەناودڵیان کوفرو گومان و بێ باوەڕی دەشارنەوەو بەزوبانیش ووشەی ئیمان دەردەبڕن. هەروەکوو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ ، يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ، فِي

(١) رواه البخاري عن أبي هريرة ..

قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ } **البقرة**: ٨ - ١٠

واتە :ـ لەناو خەڵکدا کەسانێک هەن (واتە دوو ڕووەکان) دەڵێن باوەڕمان هێناوە بەخوداو ڕۆژی دوایی، بەڵام ئەوانە باوەڕدارنین ﷺ وا دەزانن خوداو باوەڕداران هەڵدەخەڵەتێنن کەچی تەنها خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن و هەست بەمە ناکەن ﷺ دڵەکانیان نەخۆشی تێدایە جا خوداش نەخۆشیەکەیان لەسەر زیاد دەکات و سزایەکی بەئێش و ئازاریان بۆ ئامادەکراوە بەهۆی ئەو درۆیانەی دەیکەن .

هەروەها بەڵگەش هەیە لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)کە فەرموویەتی :ـ (**ما مِن أحَدٍ يَشهَدُ أن لَا إلهَ إلَا اللّه وأنَ مُحَمداً رَسوُل اللّه صِدقاً مِن قَلبِه إلا حَرَمَهُ اللّهُ عَلَى النَار**)[1]

واتە :ـ هەرکەسێک شایەتی بدا کەهیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە (اللّه) وە (محمد) نێردراوی خوایە بەڕاستی بیڵێ لەدڵەوە ئیلا خوای گەورە لاشەکەی حەرام دەکات لەسەر ئاگری دۆزەخ .

کەواتە دەبێ موسڵمان لەدڵەوە بەڕاستی باوەڕ بهێنێ و بەزوبانیش ڕاستگۆبێت و بەکردەوەش ڕەفتاری ڕاست و دروست ئەنجام بدات و هەردەم لەگەڵ کۆمەڵی ڕاستگۆیاندابێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ } التوبه: ١١٩

واتە :ـ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و لەگەڵ کۆمەڵی ڕاستگۆیاندابن .

شەشەم : الإخلاص (خوا پێ مەبەست بوون) .

واتە : تەنها نیازو مەبەستت ڕەزامەندی خوای پەروەردگاربێت لە هەموو گوفتارو ڕەفتارە چاکەکاندا، بەهیچ شێوەیەک مەبەستت

(١)أخرجه البخاري ومسلم..

ناوبانگ و ڕەزامەندی خەڵکی و پاداشتی دونیایی نەبێ . هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی :ـ

{وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ }**البينة**: ٥

واتە: ـ فەرمانیان پێنەکراوە تەنها بەوە نەبێ کە خودا بپەرستن بەنیازپاکی و خوا پێ مەبەست بوون ، ئاین هەر مووی هەر ربۆ ئەو وە .

هەروەها پێغەمبەری خواش(ﷺ)فەرموویەتی :ـ

(**إنَ اللّهَ قَد حَرَمَ عَلَى النارِ مَن قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه يَبتغي بِذلِكَ وَجهَ اللّهِ**)رواه الشيخان

واتە : خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر ئاگری دۆزەخ کەسێک بڵێ (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه**)مەبەستی پێ ڕەزامەندی خوابێ .

**حەوتەم : المحّبّه (خۆش وویستن) .**

واتە : خۆش وویستنی خودا کە پەرستراوی هەقەو خاوەنی هەموو بەخشش و نیعمەتێکە بەسەر بەندەکانی، هەروەها خۆش وویستنی بەرنامەو ئایین و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)بەشێوەیەک کە هیچ شتێکت لەلا خۆشەویست تر نەبێ لەخواو پێغەمبەرو ئایینی ئیسلام هەروەها خۆش وویستنی بەندە چاکەکان و باوەڕدارانی خوا کە خۆشەویستی خوان، واتە گەر کەسێکت خۆش ویست لەبەر خوا خۆشت بوێت لەبەرامبەریشدا ڕقت لەدوژمنانی خواو شوێن کەوتووانی شەیتان و ستەمکاران ببێتەوە بەمەش ئەگەر ڕقت لەکەسێک بێتەوە هەر لەبەر خوا ڕقت لێ ی ببێتەوە . هەروەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێ :ـ

{وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ۗ} **البقرة**: ١٦٥

واتە :ـ کەسانێک هەن لەخەڵکی جگە لەخودا کەسانێکی تر بەهاوشێوە دەگرن و وەکو خوا خۆشیان دەوێن، بەڵام باوەڕداران خۆشەویستیەکی توندترو زیاتریان هەیە بۆ خودای گەورە .

شیخ الاسلام (ابن تیمیه) فەرموویەتی :.

ئەمانە بۆیە بەخراپە باسیان کراوە چونکە هاوشێوەیەکیان دانا لەنێوان خوداو پەرستراوە ناهەقیەکان لە خۆشەویستیدا، هەروەها وەکو باوەڕداران خۆشەویستی خۆیان یەکلا نەکردەوە بۆ خودای گەورە[1].

هەربۆیە بێ باوەڕان لەناو ئاگری دۆزەخدا دان بەم تاوانە گەورەیەی خۆیان دادەنێن کە دە ڵێن :ـ {تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ، إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ} الشعراء: ٩٧ - ٩٨

واتە : سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەگومڕایی و سەرگەردانیێکی ئاشکرادا بووین ﴿ كاتێک ئێوەمان یەکسان کردبوو لەگەڵ پەروەردگاری جیهانیان .

ئەوان سەرکردەو پەرستراوە ناهەقەکانی خۆیان وەکو خودا خۆش دەویست، وەکو خودا گوێڕایەڵیان دەکردن .

بۆیە هەرکەسێک لافی خۆشەویستی خودای لێ دا دەبێ سەیری بکەین کە چەند گوێڕایەڵی خوا دەکات، ئەگەر لەژێر سایەوسێبەری بێ باوەڕاندابوو وەلەناو گوناهو سەرپێچی کردنی خوادا نقووم بووبوو ئەوا پێ ی دەڵێین : درۆ دەکەی .

چوونکە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ :ـ {قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} آل عمران: ٣١

واتە : ئەی محمد (ﷺ)پێیان بڵێ : ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش دەوێت ئەوا شوێن ڕێنماییەکانم بکەون و گوێڕایەڵیم بکەن ئەوکاتە خوداش ئێوەی خۆش دەوێت و لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت، خودا زۆر لێخۆشبووە و گوناهـ پۆشەو زۆر بەزەییە .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی :ـ ( **ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ، أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا**

---

(١)حقيقة التوحيد / محمد حسان ٢٤٨..

**سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ** (١)

واتە : سێ شت هەنە لەهەر کەسێکدا هەبێ ئەوا شیرینی ئیمانی چێشتووە؛ دەبێ خواو پێغەمبەری خوای لەهەموو کەسێک و شتێکی تر خۆشتر بوێ، وە پێی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە ناو بێ باوەڕی هەروەکو چۆن پێی ناخۆشە کە فڕێ بدرێتە ناو ئاگر .

## هەشتەم : الموت عليه (مردن لەسەری) .

واتە : ژیانت بەپێی پەیڕەوکردنی ئەم ووشەیە بێت هەتا لەسەری دەمری و کۆتاییەکەشت خێرو لەسەر گوفتارو کردارێک بێت کە خوای پەروەردگار پێی ڕازی بێت . هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ} آل عمران: ١٠٢

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن بەو شێوەیەی خوا شایستەی لێ ترسانە، وە نەکەن بمرن تەنها لەکاتێکدابن کە موسڵمان بن .

هەروەها لەجابری کوڕی عبداللە (ڕەزای خوای لێ بێ)گێڕدراوەتەوە کەفەرموویەتی : پیاوێک هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو شتە واجبەکە چی یە ؟

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی :ـ (**مَن ماتَ لايُشرِك بالله شيئاً دَخَلَ الجَنَة، وَمَن ماتَ يُشرِك بِالله شيئاً دَخَلَ النار**)(١).

واتە : هەرکەسێک بمرێ و هیچ هاوتاو هاوشێوەیەکی بۆ خودا دانەنابێ دەچێتە بەهەشت، هەرکەسێکیش بمرێ شتێکی بەهاوتاو هاوشێوە بۆ خودا دانابێ ئەوا دەچێتە ئاگر .

---

(١) اخرجه البخاري ومسلم ..

هەروەها دەفەرمووێ : ( **من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة**)[1][2] واتە : هەرکەسێک کۆتا قسەی (لا الـه الا الله) بێ دەچێتە بەهەشت .

هەروەها دەفەرمووێ : ( **من مات وهو يدعولله نداً دخل النار**) [3].

واتە : هەرکەسێک بمرێت و هاوشێوەیەکی بۆخودا بڕیاردابێ دەچێتە ئاگر .

هەروەها دەفەرمووێ : ( **ما من عبد قال : لا إله الا الله ثم مات على ذلك الا دخل الجنة**) [2].

زۆر لە زانایانیش تەنها باسی حەوت مەرجیان کردووە هەروەکو **حافظ بن احمد الحكمي** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :-

| | |
|---|---|
| **وَبِشُرُوطٍ سَبْعَةٍ قَدْ قُيِّدَتْ** | **وَفي نُصُوصِ الوَحي وَرَدَتْ** |
| **فَإنَّهُ لَمْ يَنتَفِعْ قَائِلُهَا** | **بِالنُّطْقِ إلاَّ حَيْثُ يَسْتكْمِلُهَا** |
| **الْعِلمُ وَالْيَقِينُ وَالقَبُولُ** | **والأنقياد فَادْرِ مَا أقُولُ** |
| **وَالصِّدْقُ وَالإِخْلاَصُ** | **وَفَّقَكَ اللهُ لِمَا** |

---

(١) رواه مسلم

(٢) حديث صحيح رواه ابوداود والحاكم وصححه الذهبي والالبانى في صحيح الجامع ٦٤٧٩.

(٣) اخرجه البخاري واحمد .

(٤) رواه البخاري :٥٨٢٧

**وَالْمَحَبَّـــــــــــــــــــــة أحَـــــــــــــــبَّه**[١][٣]

کەواتە ئەبێ باوەڕدار هەوڵبدا باوەڕێکی پاک و پتەو دەستەبەر بکا، تاوەکو بەهۆیەوە بتوانێ لەدوا ڕۆژ لەدەرگای بەهەشت بدا، هەروەکو ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: (**فأي عبد اتخذ في هذه الدار مفتاحاً صالحاً من التوحيد، وركّبَ فيه اسناناً من الاوامر جاء يوم القيامة إلى باب الجنة ومعه مفتاحها الذي لا يفتح الا به، فلم يُعقّه عن الفتح عائق...**).

واتە: هەربەندەیەک لەم دونیایە کلیلێکی چاک هەڵبگرێ لە بەتەنها ناسین و پەرستنی خودا، هەروا فەرمانەکانی خودای جێ بەجێ کردبێ کە ددانی کلیلەکەن، لەدوارۆژدا کە دێتە بەردەم دەرگای بەهەشت ئەم کلیلەی لایە کە تەنها بەو دەرگای بەهەشت دەکرێتەوە، بەمەش هیچ کۆسپ و ڕێگرێکی نایەتە پێش لەکردنەوەیدا ...

لەم بەشەی ووتەی ابن القیم دا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کردەوە مەرج و پێویستی باوەڕە کاتێک دەبینین جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی بە ددانی کلیلەکە چواندووە، کە بێ گومان هیچ کلیلێک بەبێ ددان هیچ دەرگایەکی پێ ناکرێتەوە.

ئینجا دەفەرمووێ:

(**اللهم إلا ان تكون له ذنوب وخطايا واوزار لم يذهب عنه اثرها في هذه**
**الدار بالتوبة والاستغفار،**[١] **فإنه يُحبس عن الجنة حتى يتطهر منها**) [٢]

واتە: مەگەر ئەوکەسە باوەڕدارە چەندین گوناهو تاوانی وای هەبێ کە لەدونیادا بەتەوبەو داوای لێخۆشبوون ڕزگاری نەبووبێ

---

(١) **منظومة سلم الوصول الى علم الأصول في التوحيد**..

**لێیان١، لەم حاڵەتە ئەو کەسە ڕائەگیرێ و ڕێگای پێ نادرێ بچێتە بەهەشت تا پاک دەبێتەوە لێیان، خۆ ئەگەر بەم ڕاگیران و ناخۆشیەکانی ئەم ڕۆژەش هەرپاک نەبوویەوە، ئەوا دەبێ بچێتە ئاگر، تاوەکو چرک و پیسی تاوانەکانی لێ دەر ئەچێ و پاک ئەبێتەوە لێیان ئینجا دەرئەچێ لەئاگرو دەچێتە بەهەشت [٣] چونکە بەهەشت جێگاو مەنزڵگای پاکانە و تەنها پاکان دەچنە ناوی خودای گەورە دەفەرمووێ :- { الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ} النحل٣٢**

---

(١)هەڵبەتە تەوبەکەی ساغ و دروست نەبووە و کەم و کوڕی هەبووە لە مەرجەکانی، ئەگینا گومانی تێدانیە کە تەوبە هەموو تاوانێکی پێش خۆی دەسڕێتەوە .

(٢)**الوابل الصيب ورافع الكلم الطيب**: ٣٣-٣٤

(٣)ئه مه به پێی وته ی ابن القيم، به لام مادام ئه و كه سه ته نها خودا به رسته ، ئه وا له زير ويستی خودای گه وره يه كه له وانه يه لێی خۆش بيت.

# بەشی سێیەم

## هاوەڵ دانان (شیرک) و جۆرەکانی

- شیرکی گەورە
- شیرکی بچوک و جۆرەکانی

## بێ باوەڕی (کُفر) و جۆرەکانی

- بەدرۆخستنەوە (**کُفر التکذیب**)
- ڕەت کردنەوەو خۆ بەگەورە زانین (**کُفر الإباء والاستکبار**)
- گومان و دوودڵی (**کُفر الشك والظن**)
- پشت لێ کردن (**کُفر الإعراض**)
- دوو ڕوویی (کُفر النفاق)
- دان نەنان (کُفر الجحود)
- گوێڕایەڵی نەکردن (**کُفر التولي عن الطاعة**)
- لاسایی کردنەوە (کُفر التقلید)
- سوکایەتی کردن (کُفر الأستهزاء)
- ڕق لێ بوونەوە (**کُفر البغض والکراهیة**)

# هاوبەش دانان بۆ خودا (شیرک )

## شیرکی گەورە :

شیرک ئەوتاوان و ستەمە گەورەیە کە هەرگیز خوای گەورە لێ ی خۆش نابێت ئەگەر خاوەنەکەی لەسەری بمرێت، مەگەر پێش مردنی تەوبە بکات و باوەڕێکی ساغ و دروست دابمەزرێنێت و خواپەرستیەکی ڕاست و دڵسۆزانە ئەنجام بدات، هەروەکوو دەفەرمووێ :-

{وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا، إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا} الفرقان: ٦٨- ٧٠

کەواتە پێویست بوو لەسەرمان بزانین شیرک چیەو چۆنە ؟

شیرک : بریتیە لە بڕوابوون بەبوونی هاوەڵێک بۆ خودا لەدەسەڵات و بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانی، یان دانان و بڕیاردانی هاوشێوەک بۆخودا لەسیفەتێک یان چەند سیفەتێک کە خودا تەنهایە تێیدا، یان ئەنجام دانی کارە پەرستشەکانی دڵ یان بەگوفتار یان بەکردار بۆ کەسێک یان شتێک جگە لەخودا یان لەگەڵ خودا (**نعوذ بالله**).

ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :- (**وأصل الشرك : أن تعدل بالله تعالى مخلوقاته في بعض مايستحقه وحده، فإنه لم يعدل أحد بالله شيئاً من المخلوقات في جميع الأمور، فمن عبد غيره أو توكل عليه فهو مشرك به...**) **الاستقامة ١ / ٣٤٤**

واتە : بنچینەی هاوەڵ دانان ئەوەیە هاوشێوەک بۆخودا بڕیار بدەی لەدروستکراوەکانی لەهەندێک لەو شتانەی تەنها شایستەیە بۆ خودا ئەنجام بدرێ، چونکە هیچ کەسێک لە هەموو شتەکان هاوشێوەی بۆ خودا دانەناوە،

جا هەرکەسێک جگە لەخودا شتێکی تری پەرست یان پشتی پێ بەستا ئەوا هاوشێوەی داناوە بۆخودا .

ئینجا هەر بانگەوازو بانگەشەیەک بۆئەوەی کە سیفەتێک یان کارێک کە تەنها شایستەیە بۆ خودا یان دەسەڵاتێک کە تەنها خودا کردگارو بەتوانایە تێیدا، بدرێتە دروستکراوێک و بخرێتە پاڵ ڕۆژی دراوێک و بێ دەسەڵاتێک شیرک و هاوبەش دانانە بۆخوداو پێچەوانەی بیروباوەڕی دڵ و دەروون و فیگەرەی ساغە، چونکە ئەگەر دووخودا هەبوایە ئەوا دوو دەسەڵات و دوو ویست و ئارەزوو دەبوو، بەمەش هەرکاتێک ئەم دوو ویست و ئارەزووە دژی یەکتر ببانەوە ئەوا بە دەسەڵاتەکەیان ئەوەی لەنێوانیاندایەو دروستیان کردووە تێکیان دەدا، کەواتە ژیان نەدەما، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی :-

{لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ} الأنبياء: ٢٢

ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : (**فكذلك القلب إذاكان فيهِ معبودٌ غَيرُ اللّهِ تعالى فَسَدَ فساداً لايُرجى صلاحُهُ إلا بأن يَخرُجَ ذلك المعبود منهُ، ويكون اللّه تعالى وحده إلهه ومعبوده الذي يُحبُه ويرجوه، ويخافه ويتوكل عليه ويُنيب إليه**) [١].

واتە : بەهەمان شێوەش دڵ ئەگەر هاتوو جگە لەخودای گەورە پەرستراوێکی تری تێدابوو بەشێوازێک خراپ دەبێ و تێک دەچێ کە هەرگیز ئومێدی چاک بوونەوەی بۆ نیە، مەگەر تەنها بەدەرچوونی ئەم پەرستراوە لە دڵی، بەمەش تەنها خودای گەورە پەرستراوی بێ، ئەو پەرستراوەی خۆشی دەوێ و ئومێدی پێ هەیە و لێ ی دەترسێ و پشتی پێ دەبەستێ و بۆلای دەگەڕێتەوە .هەروەها

(١)صحيح إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان، ٣٨.

لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ : ـ {وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ} النحل: ٥١

واتە : خودا فەرمووی : دووپەرستراو بۆ خۆتان دامەنێن، بێگومان پەرستراوی ئێوە تەنها یەک پەرستراوە، کەواتە هەربەتەنها لەمن بترسن .

یاخود لەکاری پەرستندا هاوەڵێک بۆخودا دابنێ ی هەروەکو بێ بڕواکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)کە کاری پەرستنیان بۆ بتەکان ئەنجام دەدا لەکڕنۆش بۆ بردن و هاوار بۆبردن و پاڕانەوە لێیان و قوربانی کردن بۆیان، دەشیان ووت : ئێمە {مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ} الزمر: ٣

واتە : لەبەرئەوە دەیان پەرستین تەنها بۆئەوەی ئەوانە نزیکمان بکەنەوە لەخوا.

کەواتە (شرک) و هاوەڵ دانان بۆخودا گەورەترین ستەمە بەرامبەر خودا کاتێک مرۆڤ دروستکراوێک لە دروستکراوەکانی خودا بکاتە هاوەڵی خودای بەدیهێنەر، بۆیە دەفەرمووێ : {لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ ۖ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ} لقمان: ١٣

واتە : هاوبەش بۆ خودا دامەنێ، چونکە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆخودا ستەمێکی زۆر گەورەیە .

هەروەها هاوبەش دانان بۆخودا تاکە گوناهە و تەنها تاوانێکە کەخودا بەدەری کردووە لە لێخۆشبوونی گەورەو بەزەیی فراوانی خۆی . هەروەکو خوای گەورە لەچەندین شوێن لە قورئاندا فەرموویەتی : {إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ۚ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا} النساء: ١١٦

واتە : بەڕاستی خودا خۆش نابێت لەوەی کەهاوەڵی بۆدابنرێت بەڵام جگە لەوە هەرچی بێت لێ ی خۆش دەبێت لەهەر کەسێک کەخوا بیەوێت، وە هەرکەسێک هاوبەش دابنێت بۆخودا ئەوا گومڕابووە بەگومڕابوونێکی دوور لەڕاستی .

هەروەها خوای گەورە بەهەشتی حەرام کردووە لەسەر ئەوکەسەی هاوبەشی بۆ دادەنێ، بەڵکو ئاگری دۆزەخی بۆ ئامادەکردووە، هەروەکو فەرموویەتی :ـ {إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ} المائدە: ٧٢

واتە : بەڕاستی هەرکەسێک هاوبەش بۆخودا دابنێ ئەوا بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام کردووە، وەجێ و شوێنی ئاگرە.

کەسێکیش هاوبەش بۆخودا دابنێ ئەوا هەموو کردەوەکانی بەتاڵ دەبێتەوە وهیچی بۆ نامێنێتەوە، تەنانەت خوای گەورە ئەم هەڕەشەیەی لەپێغەمبەرانیش کردووە و هەرخۆیشی پاراستوونی، دەفەرمووێ :

{وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} الأنعام: ٨٨

واتە : ئەگەر هاوبەشیان ڕەوابدایە بۆخودا ئەوا ئەوچاکانەی کردبوویان هەمووی بەتاڵ دەبۆوە و بێ پاداشت دەبوون .

دواجار ئەم ڕاگەیاندنەی خوای گەورە پێغەمبەری خۆشەویستیشی گرتەوە (ﷺ)کە خوای پەروەردگار پێی دەفەرمووێ :ـ {وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ} الزمر: ٦٥

واتە : سوێند بەخوا کە وەحی کراوە بۆتۆ، بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش کراوە و پێمان ڕاگەیاندوون، بەتۆش ڕادەگەیەنین کە ئەگەر هاوبەش بۆخودا دابنێ ی بێ گومان کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە و دەچیە ڕیزی ئەوانەی زەرەرمەندی دونیاو دوا ڕۆژبوون .

کەواتە (تەنها خواپەرستی) لە ئەنجامدانی کردارە پەرستشەکان ماف و ئەرکی خودایە لەسەر بەندەکان و بەهێزترین پەیوەندیە کەبەندە لەنێوان و خۆی و پەروەردگاریدا دروستی دەکات، ئەگەر ئەم پەیوەندییەش نەما، هیچ پەیوەندیەکی تر

بایەخی نامێنێ، نموونەی ئەم قسەیەش لە قورئاندا زۆرە، لەوانە پەیوەندی کوڕو باوکایەتی،

تەنانەت لەنێوان پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێ بێ) و یەکێ لەکوڕەکانی کە کافر بوو، هەروەها لەنێوان ابراهیم (سەلامی خوای لێ بێ)و باوکی کە کافربوو، وە لەنێوان پێغەمبەران نوح و لوگ (سەلامی خوایان لێ بێ)و خێزانەکانیان کەکافربوون، هەورەها لەنێوان پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)و (أبو تالب) ی مامی کە کافربوو، دواجار لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)و کەس و کارەکانیان کە بێ باوەڕبوون و لەبارەی هەڵوێستی باوەڕدارانەیان چەندین ئایەت دابەزیووە وێنەی ئایەتی : {لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ} **المجادلة: ٢٢**

ئینجا بڕیارو فەرمانی خودا بۆئێمەش دێت کەهەمان هەڵوێستی باوەڕدارانەی پێشینە چاکەکانمان هەبێت بەرامبەر باوک و براکانمان ئەگەر کافربوون ، هەروەکو دەفەرمووآ :

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} التوبه: ٢٣

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە باوک و براکانتان مەکەن بەنزیک و خۆشەویست و پشتیوانتان ئەگەر بێ باوەڕییان لەلا خۆشەویستر بوو لەباوەڕهێنان، هەرکەسێکیش لەئێوە خۆشیان بوێت و پشتیوانیان بکات ئەوانە بەڕاستی ستەمکارن .

جا شێوازەکانی ئەم جۆرە شیرکەش جۆراو جۆرن، هەرلەبە گەورە زانینی جگە لەخودا بەجۆرێک بیخەیتە ئاستی خودای بەرزی بەتوانا لەگەورەیی دا، ئینجا لێ ی بپاڕێیەوەو داوای پێویستیەکانی لێ بکەیت و هاوارو هانای ببەیە بەر، وەیان خۆشت بوێت، وە لێ ی بترسیت بەئەندازەی ترس لەخواو خۆشەویستنت بۆخودا. هەروەکو ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ:

| | |
|---|---|
| الشِّـرْكُ فَاحْـذَرْهُ فَشِرْكٌ ظَــــاهِرٌ | ذا الْقِسْـمُ لَـيْسَ يُقَابِـلِ الغُفْـــــرَانِ |
| وَهْوَ اتِّخَاذُ النِّـدِّ لِلـرَّحْمَنِ أيًّـــــا | كَانَ مِنْ حَجَـرٍ وَمِنْ إِنْسَـانِ |
| يَدْعُـوهُ أَوْ يَرْجُـوهُ ثُـمَّ يَخَافُــــــهُ | وَيُحِبُـهُ كَمَحَبَّـةِ الرحمـنِ[١] |

واتە :

ووریـابە لـەشیرکێک کـە ئاشـکرایە
ئەم بەشە هەرگیز خودا نە یبەخشایە
کـەسێ هاوشێوەیـەک دابـنێ بۆخــودا
بـە ردە ،ئە ستیرە ، یـــا ئادە مــیزایـە
ئومێدی پێ بێ، بپاڕێتەوەو بترسێ لێ ی
یا بەقەد خـودا خۆشـەویستی لە دڵایـە

(ئینجـا کەشـیرک و هـاوەڵ دانـان گـەورەترین سـتەمەو ناشـیرین تــرین ناشــرینەکانەو خراپتــرین خراپەکانــە، هــەر بۆیــە خــودای گـەورە لەهـەموو شتێک زیـاترو زۆرتـر ڕقـی لێیـەتی و چـەندین سزای دونیـاو دوارۆژی لەسـەر دانـاوە کـە بـۆهیچ تـاوانێکی تـر داینـەناوە، هەواڵیشی داوە کـە لەشـیرک خـۆش نابێـت و خاوەنەکـەی پیسـن و قەدەغەی کردووە موشریکەکان لە ماڵەکەی نزیک بکەونـەوە، وە ماڵاتی سەربڕاویانی حـەرام کـردووە و موسڵمانانی قەدەغـەکردووە کـە ئافرەتـەکانیان بهێـنن، وە دۆسـتایەتی و پشـتیوانی لـەنێوانیان و موسـڵمانانی پچـڕاندووە، وە بــەدوژمنی خـۆی و مەلائیکەتــەکانی و پێغەمبەرانی و برواداراانی داناون، ڕێگای بەخـەڵکی خواپەرست داوە دەست بگـرن بەسـەر ماڵ و منداڵـەکانیان و بیانخەنـە ژێـر چاودێری

خۆیان، ئەمەش لەبەرئەوەی شیرك لەباربردنی مافی پەروەردگاریەتی و بەکەم گرتنی گەورەیی خودایە،

هەروا بردنی گومانی خراپە بە پەروەردگاری جیهانیان، هەروەکو خودا دەفەرمووێ:- {وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ } الفتح: ٦ [٢] [١]

شێوازێکی تر لەم جۆرە شیرك و هاوەڵ دانانە بۆ خودا (سبحانە وتعالی)کە لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆشماندا لەزۆربەی کۆمەڵگا موسڵمانەکان بڵاووباوە ئەوەیە کە خەڵك پەنا دەباتە بەر گۆڕو ئارامگەی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) و پیاوچاکان بەمەبەستی جێ بەجێ بوونی پێویستیەکانیان لە لایان،

هەروەکو ابن تیمیه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ(**وأما من يأتي إلى قبر نبي أوصالح، أومن يعتقد فيه أنه قبر نبي أو رجل صالح وليس كذلك، ويسأله حاجته مثل أن يسأله أن يزيل مرضه، أو مرض دوابه، أو يقضي دينه، أو ينتقم له من عدوه، أويعافي نفسه وأهله و دوابه، ونحو ذلك مما لايقدر عليه الا الله (عزوجل) فهذا شرك صريح، يجب أن يستتاب صاحبه، فإن تاب وإلا قتل**) [٢]

واتە : ئەوەش کە دەچێتە لای گۆڕی پێغەمبەرێك یان پیاوچاکێك، وەیاخود بەگومانی ئەوەی گۆڕی پێغەمبەرێکە یان پیاوچاکێك و واش نیە، ئینجا داوای پێداویستی لێ دەکات وەك ئەوەی داوای نەمانی نەخۆشیەکەی، یان نەخۆشی ئاژەڵەکانی لێ بکات، یان قەرزەکەی بداتەوە، یان تۆڵەی بستێنێ لە دوژمنەکەی، یان خۆی و خێزانەکەی و ئاژەڵەکانی چاك بکاتەوە، وەشتی تریش لەم بابەتانەی کەتەنها لەتواناو دەسەڵاتی خودای گەورەدایە، جا ئەمە هاوەڵ دانان و شیرکێکی ڕاشکاوە، پێویستە داوای تەوبە لەخاوەنەکەی بکرێت، ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەر نا دەکوژرێ

---

(١)شرح نونية ابن القيم لابن عيسا٢٦٣/٢

(٢) **صحيح إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان ٧٣ – ٧٤ ).**

(٢)مجموع الفتاوى (٧٢/٢٧) بەکورتکراوەیی ..

سەیریش لەوەیە ئەم جۆرە کەسانە لەهێنانەوەی بیانوو بەهانە بۆ ئەم کارانەیان، دەکەونە ناو شێوازێکی تری شیرک و هاوەڵ دانان بۆ خودا (سبحانە وتعالى)، بۆنمونە : کاتێ پێیان دەڵێ ی بۆچی ڕاستەوخۆ لەخودای کردگار ناپاڕێنەوە، بۆچی ئەم شتانە دەخەنە نێوانی خۆتان و ئەم خودایەی کە (سمیعٌ) بیسەرو (قریبٌ) نزیکە ؟ دەڵێن ئێمە ئەوان دەکەین بەهۆکاری گەیشتنی داواکاری و پێداویستیەکانمان بە خودای گەورە و ئەوان داواکاریەکانمان دەگەیەنن بەخودا، هەروەکو چۆن خەڵک داواکاریەکانیان دەبەنە لای دەرگەوان و ڕاوێژکارانی پاشا، تا ئەوانیش بۆیان بەرزکەنەوە بۆ پاشا "بەمەش تووشی هاوشێوەدانان بوون بۆخودا لەو ڕووەوەی کە دروستکراوێکیان (پاشایەکی سەر زەوی)وێک چوواند بە بەدیهێنەری دروستکراوەکان[*] هەروەکو ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :.( **من أثبت وسائط بين الله وبين خلقه، كالوسائط التي تكون بين الملوك والرعية، فهو مشرك، بل هذا دين المشركين عُبّاد الأوثان كانوا يقولون: إنها تماثيل الأنبياء والصالحين، وإنها وسائل يتقربون بها إلى الله، وهو من الشرك الذي أنكره الله على النصارى**) [1] .

واتە : هەرکەسێک نێوەندو هۆکار دابنێ لەنێوان خوداو دروستکراوەکانی، وەک ئەو نێوەندو هۆکارانەی هەیە لەنێوان پاشاکان و نەتەوەکانیان، ئەوکەسە موشریکە،

بەڵکو ئەمە ئایینی هاوەڵ دانەرو بت پەرستەکانە، کاتێک دەیانووت : ئەمانە تەنها پەیکەرێکن بۆ پێغەمبەران و پیاوچاکان، تەنها هۆکارێکن بۆئەوەی بەهۆی ئەوانەوە لەخودا نزیک ببنەوە، ئەمەش لەو شیرک و هاوشێوە دانانەیە کە خودای گەورە لە

---

(*) لەراستیشدا هیچ وویێک چوونێک نیە وەک ئەوان گومانیان دەکرد بەڵکو بەپێچەوانەوە مەگەر نابینن کە پادشا و دەسەڵاتدارەکان بەبوونی دارودەستەو سەربازەکانیان پادشان و بەبێ ئەوان هیچ نین، کەچی خودای گەورە پادشایەکی بێ وێنەو بێ نیازە، هیچ پێویستی بەهیچ کەسێک نیە، بەڵکو هەموو شتێک پێویستی بەوە.

(١)مجموع الفتاوى (١٣٤/١ – ١٣٥).

گاورەکانی قەبولْ نەکردو سەرکۆنەی کردن. ئینجا سەرنج بدە کاتیْ (ابراهیم)(سەلامی خوای لیْ بیْ)،

ئەبەستریێتەوەو ئامادە دەکریْ بۆئەوەی هەڵبدریێتە ناو ئاگر، جبریل (سەلامی خوای لیْ بیْ) کە گەورەترین مەلائیکەی خودایە دەچیْ بۆ بەهاناوەچوون و یارمەتی دانی ابراهیم (سەلامی خوای لیْ بیْ)ئەگەر داوابکات، بەڵام ابراهیم (سەلامی خوای لیْ بیْ) باوکی پیێغەمبەران و پیێشەنگی خواناسانی ڕاستەقینە پیێی دەفەرمووێ : بۆلای تۆ نەخیێر، بەڵکو هانام بۆلای ئەوکەسەیە کە لەتۆ ئاگادارترو نزیکترە لەمن، بیْ گومان خودای تەنهاو بەتواناش نزیکتربوو کە فەرمووی :ــ {قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ} الأنبياء: ٦٩

**شیرکی بچووک :**

**١ – ڕووپامایی (الریاء)**

**ڕیـآ : لەزمانەوانیـدا واتــە : خـۆ جـوان کـردن بـەکارو ئاکـارو سیفەتێک و پیشاندانی بەخـەڵکی، کـە لەڕاستی دا ئـەم ئاکارو سیفەتە هی خۆت نەبن. جا ئەمەش ئەگەرچی تاوانێکی گەورەیـە بـەڵام خاوەنەکـەی پـێ لەئیسلام دەرناچـێ . وە لـەمانای شـەرعیدا : واتـە خـەڵک پـێ مەبەسـت بـوون لـەکاتی پەرستنی خـوادا، نیـازت لەئەنجامدانی هەرکارێک مـەدح و سوپاس و ڕەزامەنـدی خـەڵک بـێ تـا سـەرنجیان بـۆ لای خـۆت ڕادەکێشـی و ناوبانگـت لـەناویان بڵاودەبێتەوە و پلەو پایەو ڕێزو حورمەتێک پەیدادەکەی لە لایان .**

**ئنجا جاری واهەیـە ئـەوکارەی ئـەنجامی دەدا بەتـەواوی مەبەسـتی تێیدا پەیداکردنی ناوبانگ و بەرژەوەندیەکی دونیایی یە، کە بـێ گومان خاوەنەکەی لەم کارەی دا شایستەی توورەیی و سزای خـودای گەورە دەبێ .جاری واش هەیە نیـازو مەبەستی خودایـە، بـەڵام نیـازی تـری تێکـەڵ دەبـێ، لەمەشدا خـودای بـەرزی بـێ وێنـە دەوڵەمەنـدترە لـەوەی کەسـێکی لەگـەڵ بکرێتـە هـاوەڵ لـەنیازو مەبەسـتدا لەبەرئەوە دیسان خاوەنەکەی مایەپوچ و زەرەرمەند دەبێ،**

**هـەروەکو لەفەرموودەیەکـدا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)دەفـەرمووێ :** ( **قال الله تبارك وتعالى : أنا أغنى الشركاء عَنِ الشِركِ، مَن عَمِلَ عملاً أشرك فيه مَعيَ غيري تركتهَ وشِركَه**). رواه مسلم في صحيحه

**واتــە : خــودای گــەورە دەفــەرمووێ: مــن لەهــەموو هاوبــەش و هاوکارەکــان دەوڵەمــەترم لــەوەی پێویسـتیم بەهاوبــەش هــەبێ، هەرکەسێک کارێک ئەنجام بدات لەگـەڵ منـدا کەسێکی تـر تێیــدا بکاتــە هاوبەشــم لەمەبەسـتی دا، ئــەوا واز لــەخۆی و هاوبەشەکەی دێنم و پێویستم پێ ی نیە.**

**ئینجا لەفەرموودەیـەکی تـری پێغەمبـەر (ﷺ) کـە ئیمـامی مسلم ڕیوایــەتی کــردووە هەڕەشــەیەکی ترســناکی تێدایــە بــۆ**

ئەوکەسانەی کەلە ڕواڵەتدا (فیما یبدو للناس) ئەوەی خەڵک لێیانی بینی بوو، خەریکی خێرو چاکەی گەورەبوونە کە ئەوانیش یەکەمیان : کەسێکە کە لەجەنگ و جیهاد دا شەهید بووە، دووەمیان : زاناو قورئان خوێنێکە، ئەوی تریان : خوا پێداوو دەوڵەمەندێکە، بەڵام کەخوا شارەزابووە بەمەبەستی دڵیان و زانیویەتی کارەکانیان بۆخوا نەبووە، پێیان دەڵێ : درۆ ئەکەن، بەڵکو بۆناوبانگی خۆتان هەوڵتان داوە، بۆیە فەرمان دەکا لەسەر ڕوو ڕابکێشرێن و فڕێبدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ (خودا پەنامان بدات)
.

کەسانێك جەستەیان ماندوو شەکەتە       ڕەزاو ڕامانی خەلکیان مەبەستە

بۆ کێ دەیکەی بەد بەختی داماو       بۆچی ڕەنج ئەدەی لارو تێك شکاو

هەرتەنها بۆتیله چاوێکی بەندە       خۆت ئەکوژی و نایهێلی بە ڕووتدا خەندە

یا لەبەر باس و ناوبانگ و نازێ       دەی ئەوا ووتیان چیت هاتە سازێ

نوێژ ئەکەی وەستاوی مل مات و مەلوول       دلیشت بۆخەلکی پەروانەو گێژە لوول

بەرماڵ بەرنادەی زۆر باسی خۆت ئەکەی       بیسکە و قرچۆك کەم یادی خوا ئە کە ی

دەورو دروێنەت ڕەنج بەخەسار بوو       لەو دونیاش لای خوا کردارت بەتاڵ بوو

هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی :

{فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ * الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ * وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ} الماعون: ٤ - ٧

واتە : هاوارو نەهامەتی بۆ نوێژکەران ۞ ئەوانەی کە لەنوێژەکەیان بێ ئاگان (واتە لەکاتی خۆی نایکەن و دوای دەخەن) ۞ ئەوانەی کە ڕووپامایی دەکەن لەکارەکانیان۞ وە یارمەتی خەڵک نادەن و ڕێگری دەکەن لە چاکەکردن .

کە ئەمەش بەڕاستی سیفاتی دوو ڕووەکانە کە نوێژەکان دوادەخەن، کە دەشیکەن بەتەمبەڵی و سستی دەیکەن هەروەها ڕیا سیفەتی کافرو بێ باوەڕەکانە کە لەبارەیانەوە فەرموویەتی :

{وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِم بَطَرًا وَرِئَاءَ النَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ} الأنفال: ٤٧

واتە : وەکو ئەوانە مەبن کە کاتێک دەرچوون لەماڵ و وڵاتی خۆیان بەفیزەوە بوون و ڕووپامابییان بۆ خەڵک دەکردو ڕێگریان لەخەڵکی دەکرد بێنە سەر ڕێگەی خوا .

هەربۆیەش پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ)زۆرجار ئوممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لەم دەردە کوشندەیە، هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە فەرموویەتی :

( **إنَ أخوَفَ ما أخافُ عَلَيكُم : الشِركُ الأصغَرُ** )

واتە : بەڕاستی ترسناک ترین شت کە لێیەوە لێتان بترسم هاوبەش دانانی بچووکە .

قالوا : **وَمَا الشِركُ الأصغَرُ يا رسُولُ الله** ؟

واتە: فەرموویان هاوبەش دانانی بچووک چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟

**قَالَ: الرِّيَاءُ، يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا جُزِيَ النَّاسُ بِأَعْمَالِهِمْ اذْهَبُوا إِلَى الَّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاءُونَ فِي الدُّنْيَا فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً؟** [(١)].

واتە/فەرمووی : ڕیا (ڕووپامایی) خوای (بەتواناو بەشکۆ) لەڕۆژی قیامەت کاتێک کە خەڵک پاداشتی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، دەفەرمووێ پێیان بڕۆن بۆلای ئەوکەسانەی لەدونیا بۆ ئەوان کارەکانتان ئەنجام دەدا بزانن لەلای ئەوان پاداشتتان بەدەست دەکەوێ ؟

---

(١)**حديث صحيح** : **رواه احمد في مسنده وغيره، صحيح الجامع** (٣٢٣/١) **برقم** (١٥٥٥).

بەڵام ئەگەر باوەڕدار مەبەستی لەخوا پەرستی کردەوەکانیدا ڕەزامەندی پاداشتی خوای پەروەردگاربوو، وە لەلایەن خەڵکیش بەچاکە باسی کراو ڕێزو پایەی بۆ دانرا ئەوا هیچ شتێکی تێدانیە جێگای گومان و مەترسی بێ بەڵکو زۆر ئاساییە چونکە ئەمەش فەزڵ و پایەیەکە خوای گەورە دروستی دەکات لەدڵی خەڵکی بۆ ئەم باوەڕدارە .

هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە **أبي ذر** (خوای لێ ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە کە بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)ووترا : ئایا ئەگەر پیاوێک چاکەو خێر بکاو خەڵکیش ستایشی بکەن و مەدحی بکەن پێت چۆنە ؟

فەرمووی : (**تِلكَ عاجِلُ بُشرى الُمؤمِن**)[١].

واتە / ئەوە مژدەیەکی بەپەلەیە لەدونیا بۆ باوەڕدار .

هەروەها چەند شتێکی تر هەن کە شیرکی بچووکن، هەرکەسێک بیانکات گوناهبار دەبێ و پێویست دەکات زوو تەوبەی لەسەر بکات، بەڵام بەکردنی لەبازنەی ئیسلام دەرناچێ.

٢ - سوێند خواردن بەشتی تر جگە لەخودا.

وەکو سوێند خواردن بەگۆڕی فلان و سەری فلان و شێخ فلان و خوێنی شەهیدان و نیشتمان و هی تر، سوێند تەنها بەخوای گەورە یاخود قورئانی پیرۆز دەخورێ وەنابێ بەهیچ شتێکی تر بخورێ، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:( **مَن حَلَفَ بِغَيرِاللهِ فَقَد أشرَك**) [٢].

واتە/ هەرکەسێک سوێند بخوا بەغەیری خودا ئەوا هاوبەشی بۆخوا بڕیارداوە.

بەڵام ئەگەر کەسێکی لەلا بەڕێزو پیرۆزبوو وەکو خودا، بۆیە سوێندی پێ دەخوارد ئەوکاتە دەبێت بەشیرکی گەورە .

---

(١) **رواه مسلم (٢٦٤٢) وغيره.**

(٢) **رواه أبو داود والترمذي وصححه الألباني.**



٣ – چوونە لای فاڵچی و نوشتەبازان و باوەڕپێکردنیان :ـ

هەروەکو پێغەمبەری پێشەوا ((ﷺ) فەرموویەتی :

( **مَن أتى كاهِناً أو عَرافاً فَصدَقَهُ بما يقوُل فقد كفر بما أنـزل على محمد** )[١].

واتە/ هەرکەسێک بچێتە لای فاڵچیەک یان کەسێک بانگەشەی زانینی غەیب و پەنهانەکان بکات، وە باوەڕیش بکات بەوەی دەیڵێ ئەوا بێ باوەڕ بووە بەو قورئانەی بۆ محمد (ﷺ) دابەزیووە .

هەروەها دەفەرمووێ : ( **مَن علَقَ تميمةً فقد أشرك** )[٢].

واتە/ هەرکەسێک نوشتەیەک هەڵواسی ئەوا هاوبەشی بۆ خودا بڕیارداوە .

ئینجا ئەم نوشتەیە هەندێ جار پارچە ئێسکێکە یان تاکە نەعلەکە بۆ چاوزار یان ناڵی گوێ درێژێکە یان شتی تر، هەرکەسێک ئەم شتانە هەڵبواسی وە باوەڕی هەبێ کە ئەم شتانە دەیپارێزن یاخود خراپەو زەرەری خەڵکی لێ لادەدەن ئەوا سیفەتێکی داوەتە پاڵ ئەم شتانە کە تێیاندانیە بەڵکو سیفەتی خوای گەورەیە کە پاراستن و زەرەر لێ لادانە، هەروەها سوودو قازانج گەیاندنە .

ئینجا هەروەکو شرک دووجۆری هەیە (شیرکی گەورەو شیرکی بچووک) کوفریش دووجۆری هەیە:

١ – **كفرٌ مُخرِج عن المِلَة** : واتە ئەو کوفرەی خاوەنەکەی پێ لەئیسلام دەردەچێ .

٢ –**كفرٌ لم يخرج عنِ الملة** : واتە ئەوکوفرەی کە خاوەنەکەی پێ لەئیسلام دەرناچێ، ئینجا لەم بەشەدا ووشەی (کفر) کە لەئایەت و فەرموودەکاندا هاتووە بە واتای (کفر دون کفر) ە .

---

(١) **رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه وصححه الالباني.**

(٢) رواه احمد والحاكم وصححه الألباني.

 

## ماناى (الكفر) :-

لەزمانەوانیدا بەمانای داپۆشین و شاردنەوەی شتێک دێت، هەروەکو بەجووتیار دەووترێ کافر چونکە دانەوێڵە لەناو زەوی دەشارێتەوەو بەخۆڵ دایدەپۆشی، هەروەها بەشەو ووتراوە کافر چونکە بەتاریکیەکەی خەڵک و هەموو شتێک دادەپۆشی"[1]..

ئینجا بۆیە بە مرۆڤی بێ باوەڕ دەووترێ کافر چونکە هەقی خودا دەشارنەوە لەپەرستندا، واتە ڕاستی و شایستەیی خودای پەروەردگار دەشارنەوە لەپەرستندا بە پەرستنی شتێکی پووچ و بەتاڵ، ابن تیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :

(کوفر بریتیە لەباوەڕنەبوون بەخوداو پێغەمبەرانی، ئینجا چ بەدرۆخستنەوەی لەگەڵ بوو یان لەگەڵی نەبوو، بەڵکو گومان و دوودڵی تێدابوو، یان پشت کردن بوو لەمانە بەهۆی ئیرەیی و لووت بەرزی، یان شوێن کەوتن بوو بۆ هەندێ لەو بیروڕایانەی لادەرو کۆسپن لەشوێن کەوتنی پەیامی خودا) [2].

---

(١) نواقض الايمان القولية والعملية : ٤٠ .

(٢) مجموع الفتاوى (١٢/٣٣٥)..

## جۆرەکانی کوفری گەورەش بریتین لە[*]:

١ – **كفر التكذيب** (کوفری بەدرۆخستنەوە) .

هەرکەسێک ئایینی ئیسلام یان ئایەتێکی قورئان یان پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ) بە راست نە زانێ و بەدرۆیان بخاتەوە ئەوا کافربووە و لەبازنەی ئیسلام چووەتە دەرەوە بەڵگەش فەرمایشتی خوایە کەفەرموویەتی :

{وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ ۚ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ} العنكبوت: ٦٨

واتە/ کێ لەوکەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستێ یان ئایینی ڕاست بەدرۆبخاتەوە کاتێک بۆی هات، ئایا لەدۆزەخدا جێگایەکی مانەوە نیە بۆ بێ باوەڕان ؟

٢ –كفر الإباء والاستكبار مع التصديق :-

(کوفری ڕەتکردنەوەو خۆ بەگەورەزانین سەرەڕای بەڕاست زانینی). هەرکەسێک فەرمانەکانی خوداو فەرزەکانی ڕەت بکاتەوە و خۆی بەگەورەتر بزانێ لەوەی مل کەچی بۆیان بنوێنێ وێڕای ئەوەی بەڕاستی بزانی، وەکو کوفری ئیبلیس (**لَعَنَهُ اللّه**) بەڵگەش ئایەتی : {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ} **البقرة**: ٣٤

واتە : کاتێک ووتمان بە مەلائیکەتەکان سوژدە ببەن بۆئادەم، جا هەموو سوژدەیان برد، جگە لە ئیبلیس کە ڕەتی کردەوە خۆی بە گەورەتر زانی بەمەش بووبە یەکێک لەبێ باوەڕان.

جا لەوکاتەوە ئیبلیس بووبە هێماو نیشانەی سەرپێچی کردنی خواو ڕەتکردنەوەی فەرمانەکانی، بەڵام مەلائیکەتەکان بەردەوام لە گوێڕایەڵی کردنی خودا (سبحانە وتعالی) بوون .

---

(*) سەیری أقسام الكفر مفتاح دارالسعاده لأبن القيم الجوزيه ٣٣١/١ بکە

٣ - **كفر الشك والظن** (کوفری گومان و دوو دڵی) .

هەرکەسێک گومانی هەبێ لە بەڵێنەکانی خوا یان گومانی هەبێ لەرۆژی دوایی و پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) ئەوا کافرەو بەڵگەش فەرمایشتی خوایە کەفەرموویەتی :ـ {وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ} **الجاثية**: ٣٢

واتە:ـ هەرکاتێک بووترایە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ڕۆژی دوایی هیچ گومانی تێدا نیە، دەتان ووت نازانین ڕۆژی دوایی چی یە و ئێمە گومانمان هەیەو دڵنیا نین .

هەروەها لەئایەتی پێشتردا (٣١) ڕوونی کردۆتەوە کە ئەمە حاڵی کافرەکان بووە ئایەتەکانی خودایان بەسەردا خوێنراوەتەوە و ئەمە هەڵوێستیان بووە .

٤ - **كفر الإعراض** (کوفری پشت لێ کردن).

هەرکەسێک باوەڕی بە هەواڵە مژدەدەرەکان و ترسێنەرەکانی قورئان نەبێت و ڕووی لێ وەربگێڕێ و پشتی تێ بکات ئەوا کافرە بە بەڵگەی ئایەتی :ـ

{وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ} الأحقاف: ٣

واتە : ئەوانەی بێ باوەڕن لەوەی پێ ی ترسێندرابوون ڕوویان وەردەگێڕا و پشتیان تێ کردبوو.

٥ – کفر النفاق (کوفری دوو ڕوویی) .

ئەمەش هەرکاتێک کوفر چووە دڵیان و جێگیربوو پاش ئەوەی باوەڕیان هێنابوو، واتە بەڕواڵەت خۆیان بە موسڵمان نیشان بدەن و لەناخیشدا دڵیان بێ باوەڕبێت ئەوا کافرن بە بەڵگەی ئایەتی : ـ {ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ } المنافقون: ٣

واتە : ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە ئەوان (واتە دوو ڕووەکان) باوەڕیان هێنا پاشان کافربوون بەمەش مۆر درا بەسەر دڵیاندا ئیتر ئەوان هەرگیز تێ ناگەن .

٦ - **كفر الجُحُود** (کوفری دان نەنان بەوەی لەدڵ چەسپاوە).

هەرکەسێک لەدڵیدا ڕاستی ئاینی ئیسلام و ئایەتەکانی قورئانی تێدا چەسپابێ بەڵام لەبەر خۆبەگەورە زانین و ستەمکاری مل کەچی نەبن و دانی پێدا نەنێن و ڕەتی بکەنەوە، بەبەڵگەی فەرمایشتی خودا کە فەرموویەتی :ـ

{وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ} النمل: ١٤

واتە : دانیان نەنا بەو موعجیزانەی کە لەدڵی خۆیاندا بەڕاستیان دەزانی، بەهۆی ستەم و خۆ بەگەورە زانینیان، جا سەرنج دە سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بوو.

٧ - **كفر التَوَلي عَنِ الطاعة** (کوفری گوێڕایەڵی نەکردن) .

ئەمەش بە گرنگ وەرنەگرتنی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرە بەوەی گوێڕایەڵی شتێکی تر یان کەسێکی ترت لەلا گرنگتر بێ، کە ئەمەش نیشانەی ڕووکردنە باگل و پشتکردنە لەهەق، کە سەرەنجامەکەش پشت کردنە لەکارو گوێڕایەڵی کردنی خوداو پێغەمبەر(ﷺ).

هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ {قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ} آل عمران: ٣٢

واتە : بڵێ فەرمانبەری و گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) بکەن، ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوا بەڕاستی خودا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت .

٨ - **كفر التقليد** (کوفری لاسایی کردنەوە) .

ئەمەش کاتێک لاسایی کردنەوە و شوێن کەوتنی ڕێساو ڕێبازی چەوتی باووباپیران بکرێتە پەیڕەوو وەکو ئایین سەیری بکرێ،

ئەگەرچی پێچەوانەی بنەماو بنچینەکانی ئایینی ئیسلامیش بێ . هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی :-

{وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۗ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ} **البقرة**: ١٧٠

واتە : کاتێک پێیان بووترێت شوێن ئەو قورئانە بکەون کەخوا ناردوویەتە خوارەوە، دەڵێن: نەخێر بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کە باووباپیرانمان لەسەری بوون ئەگەرچی باووباپیرانیشیان هیچ تێ نەگەیشتبن و گومڕابووبن .

٩ – **كفر الأستهزاء** (کوفری سوکایەتی و گاڵتەکردن بەئایین).

ئەمەش هەرکاتێک یەکێک سوکایەتی بکات و گاڵتە بە یەکێ لەپیرۆزیەکانی ئایین بکات ئەوا لەئیسلام دەردەچێ ، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی :- {وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ، لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ} **التوبة**: ٦٥ –٦٦

واتە : ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت (واتە لەم دووڕووانە کە بۆ ئەم قسانە دەکەن ؟ ) بێگومان دەڵێن : بەڕاستی ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەکەین، تۆش بڵێ : ئایا ئێوە بەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتە دەکەن ؟

بەهانە مەهێننەوە بەڕاستی ئێوە کافربوون پاش باوەڕ هێنانتان، ئەگەر ببورین لە کۆمەڵێکتان ئەوا سزای هەندێکتان هەردەدەین لەبەر ئەوەی تاوانبار بووینە .

١٠ – **كفر البُغض والكَرَاهِية** (کوفری ڕق لێ بوونەوە لەئیسلام) .

هەرکەسێک ڕقی لەئایینی ئیسلام و ئایەتی قورئان و پێغەمبەری پێشەوا ببێتەوە (ﷺ) ئەوا بێ باوەڕە و هەموو کردەوە چاکەکانیشی بەتاڵ دەبێتەوە . هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی :-

{وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ، ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ} محمد: ٨ – ٩

واتــه : ئەوانـەش کـە بـێ بـاوەڕبوون ئـەوا نەگبـەتی و سەرشـۆڕی بەشیانە خودا کردەوەکانیان پوچ و بێ مایە دەکات ﷻ ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان ڕقیان لەو قورئانە بوو کەخوا ناردوویەتی خـوداش کردەوەکانیانی پوچ و بەتاڵ کردەوە.

ئینجا ئەگەر ئەمە سزای کەسانێک بێ کـە تـەنها بـەدڵ ڕقیـان لەقورئان ببێتەوە، ئایا دەبێ سزای ئەوکەسانە چی بێ کە بەزوبان و قەڵەمیان  لە ڕۆژنامە و مالپە ڕە کان ڕۆژانە بەقورئان و پیرۆزیـەکانی ئیسلام ژەهرو ڕقی دڵیان دەڕێژن ؟ "

بــەڵکو دەبــێ ســزای ئەوانــە چــی بــێ کــە موســڵمانان لەســـەر ئایینەکـەیان ئـازاردەدەن و لەگـەڵ سـەربازو دەزگـا سـیخوڕەکانی کوفر هاوکاری دەکەن دژی موسڵمانان و سەنگەریان لێ دەگرن؟"

ئەو کوفرەش کە کوفری بچووکی پێ دەووترێت و خاوەنەکەی پێ لەئیسلام دەرناچێ، چەند شێوازو جۆرێکی هەیە، لەوانە :ـ

**کفـــــر النعمــــة** : واتــە کــوفری ســپڵەبوون بەرامبــەر بــە نیعمەتـەکانی خـوداو سوپاس نـەکردنی لەسـەری، هـەروەکو خـوای پەروەردگار

فە رمووبە تی:-{وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ} **النحل**: ١١٢

واتە : خودا نموونەی هێناوەتەوە بە (خەڵکی) شارێک کە هێمن و دڵنیـا بـوون، ڕزق و ڕۆزی زۆریـان بـۆ دەهـات لەهـەموو شـوێنێکەوە کەچـی بەرامبـەر چـاکەو بـەهرەکانی خـودا ناسوپاسـگوزارو سـپڵەبوون، جـا خـودا بەوهۆیـەوە بەبـەر خەڵکەکەیـدا کـردی پۆشاکی برسێتی و ترس لەبەر ئەو کردەوانەی دەیانکرد.

جـاری واش هەیـە بەخشـش و بـەهرەکانی خـودا دەناسـنەوە، بـەڵام خاوەنداریەتیەکەی نادەنەوە پاڵ خودای گەورە کە ئەمەش

ئەوپەڕی سپڵەیی و بەد نمەکی یە بەرامبەر خودا (جلّ وعلا)، بێ گومان کەسێکیش چاکەی خودای لەبەر چاو نەبێ،

چاکەی خەڵک و بەندەکانی خوداشی لەبەرچاو نابێ، لەمەشدا زۆرێک لەئافرەتان چاکەو جوامێری پیاوەکانیان لەیاد دەچێ و نکۆڵی لێ دەکەن کاتێ لەشتێکدا بێ دڵیان دەکەن، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ (**أُرِيتُ النَّارَ فَإِذَا أَكْثَرُ أَهْلِهَا النِّسَاءُ يَكْفُرْنَ قِيلَ أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ قَالَ يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ**)[1].

واتە : ئاگری دۆزەخم نیشاندرا، کەتێیدا زۆرترین خەڵکەکەی ئافرەت بوون کوفردە کەن، ووتیان : کوفربە خوا دە کەن ؟

فەرمووی : بەڵکو بەد نمەکن بەرامبەر چاکەی مێردەکانیان، ئەگەر بەدرێژایی تەمەنت چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەی، پاشان شتێکت لێ ببینێ و بەدڵی نەبێ دەڵێ: من هەرگیز خێرو چاکەیەکم لەتۆ نەبینیوە .

کە دەبوایە ئافرەت بەرامبەر ئەو چاکانەی پیاوەکەی، ئەوپەڕی مامەڵەی جوان و گوێڕایەڵی نیشان بدا، بەمەش هەردوولا سوود مەند دەبن بەوەی خودای گەورە درێژە بەبەختەوەری ژیانیان و خۆشەویستی نێوانیان دەدات .

خوای گەورە دەفەرمووێ : {وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ} إبراهيم: ٧

**ابن كثير** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەڕاڤەی ئەم ئایەتە دەفەرمووێ :

واتە ئەگەر شوکرانەو سوپاسگوزاری بەخششەکانم بن بەسەرتانەوە ئەوا بۆتان زیادی ئەکەم بەڵام ئەگەر بڕواتان پێ

---

(١) رواه البخاري.



نەبوو شاردتانەوەو نکۆڵیتان کرد ، ئەوا (**إن عذابي لشديد**) بـەوەی لێیان دەستێنێتەوەو سزایان دەدات لەسەر شاردنەوەی[1]..

هـەروەها ووتـراوە : (**الشـكُر قيـدُ النعمـةُ الموجـودة وصـيدُ النعمـة المفقودة**).

سوپاسگوزاری نیعمەتە بەردەستەکان دەهێڵێ، وە نیعمەتە بزربووەکانیش دێنێ .

# بەشی چوارەم

- حوکم نەکردن بەقورئانی پیرۆز
- دۆستایەتی کردن و دوژمنایەتی کردن

(١) تفسير ابن كثير (٢/٤٥٠) .



# حوکم نەکردن بەقورئانی پیرۆز

ئەوانەی ئەمڕۆ ئالوودە بوونە بەخۆشەویستی دەسەڵات و خۆیان هەڵواسیوە بەکورسی فەرمانڕەوایی و بەئەندازەی بزمارەکان، نینۆکەکانیان چەقاندووە لە پێچکەکانی ئەم کورسیە، دەڵێن : ئایین پەیوەندییەکی ڕوحی یە لەنێوان مرۆڤەکان و خودا، وە بەڕێوەبردن و بەرنامەی ژیانی خۆیانی بۆخۆیان بەجێ هێشتووە "

بەم قسەیە دەیانەوێ باوەڕدارانی پێ هەڵخەڵەتێنن :

{يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ} **البقرة٩**

دەیانەوێ ئایینی خوا بەپێی ئارەزووی خۆیان بتاشن، هەروەکو پێشینیەکانیان ئایینێکی نوێیان بۆ (قیسیس و ڕاهیبە خاچ پەرستەکان)داتاشی بەوەی کەنیسە هیچ پەیوەندیەکی نەبێ بەژیانی خەڵک و دەسەڵات، بەڵکو تەنها ئاگاداری تاق و پەنجەرەکانی پەرستگا بێ، بێ گومان ئەمەش پاش ئەو بەلاڕێ داچوون و هەڵەو ستەمانەی پیاوانی کەنیسە ئەنجامیان دەدا بەناوی ئایین. بەڵام (هیهات هیهات) ئەمەیان بۆبچێتە سەرو ئەم هەوڵەیان بۆبێتەبەر لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا چونکە :ـ

١ – پیاوانی کەنیسە ئایینیان بەکاردەهێنا بۆ بەرژەوەندی دونیایی خۆیان بۆئەمەش دەستکاری دەقەکانی ئینجیلیان دەکردو زیادەو کەمیان تێخست، بەپێچەوانەی ئایینی ئیسلام کەخاوەن پەیامێکی خوایی پارێزراوە، هیچ کەسێک ناتوانێ بنچینەیەکی نەگۆڕ بگۆڕێ.

٢ – لەم ڕۆژگارە خوای پەروەردگار مەبەست و کرداری ئەمانەشی بۆخەڵک دەرخست و بۆ هەموو جیهان دەرکەوت کەجگە لەئایینی ئیسلام هەموو بەرنامەو ڕێبازەکانی تر تەنها دروشمی بریقەدارو ناوی بێ ناوەڕۆک و خاڵی دوور لەحاڵن، چونکە خاوەن دیدو بەرنامەی پووچ و بەتاڵن .

بـەڵام لەئـەنجامی بـێ ئاگـایی لەمـەرام و مەبەسـت و بەرنامـەی ئەمانـە زۆر لەموسـڵمانان گوێیـان لێـدەگرن و بگـرە بەبانگەشـەو قاتـە ڕەشـەکانیان هەڵخەڵـەتاون، هـەروەکو خـودای زانـاو شـارەزا دەفەرمووێ :ـ

{وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ} التوبە: ٤٧

واتـە : لـەنێو ئێـوەدا کەسانێک هـەن کـە گوێیـان بـۆ ڕادەگـرن بەڵام خودا زانایە بە مەبەستی ستەمکاران .

بۆیـە دوژمنـانی ئیسلام هـەروەک چۆن توانیـان لـەڕێگای مانگـە دەسـتکردەکان و تۆڕەکـانی ئینتـەرنێت هەرچـی بیـردۆزی کـوفرو بەدڕەوشتی و ئاکـارو نـەریتی نزمـە، بـەنرخێکی هـەرزان(*)بیفرۆشـنە ئێمـەو بیگوازنـەوە نێـو ماڵـەکان و شـارو وڵاتـەکانمان، ئـەوهاش توانیویانە لەڕێگای پیاوە دەستکردەکان و تۆڕەکانی عەلمانیـەت و ئەنتـەرنێت(**) هەرچـی یاسـاو بەرنامـەی دژ بەئایینمانـە بـەناوی (دیموکراسیەت و یەکسانی و مەدەنیـەت) بیگوازنـەوە سـەردەزگاو دەسـەڵاتەکانمان، بـەڵام دەبـێ بـاوەڕدار لەبەرامبـەر دیموکراسیـەکەی ئـەوان، دیـن وەک کـراس لەبـەر خـۆی بکـات لەهەڵسـوکەوتی ڕۆژانەیـدا بائـەوان یەکسـانی لـەنێوان فـەرمانڕەواو هەژارو بێ نەوا بکەن، بائێمەش ژیـانێکی سـەربـەرزانە لـەژێر سایەی سـورەتە مەدەنیـەکان دەسـتەبەربکەین نـەک مەدەنیەتەکـەی ئەوان. دەبێ موسڵمانان ئـەوەبزانن کـە یاسـاو ڕێبـازو دەسـتورێک کـە ئەمڕۆ دەیانەوێ بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن، لەڕاستیدا هـەمووی پـوچ و بەتاڵن...

---

(*) هەروەکو دەبینین کە ئامێری سەتەلایت ومۆبایل و ئامێرەکانی تر ئەگەرچی لەرۆژئاواوە دێن بۆئێرە کەچی لەوێ نرخیان گرانترە لێرەو لە وڵاتانی موسڵمانان!!.

(**) مەبەستم دەزگا داپلۆسێنەرەکانی دەسەڵاتە عەلمانیەکانە کە ئازاری موسڵمانەکان دەدەن.

چونکە بەڕاشکاوی ڕێگە دەدەن بەبێ باوەڕی و هەڵگەڕانەوە لەئایین و سوو (**ربا**) خۆری، وە تێکەڵاوی و بەدڕەوشتی و هۆش مەستی ئاسان دەکەن و بەناوی (مۆڵەتی یاسایی) شوێنی تایبەت و گشتیشیان بۆدەکرێتەوە، ئینجا لەلایەکی تریش هەموو سزا سنووریەکانی خودا (**إقامة الحدود**)فەرامۆش دەکرێ و لەکار دەخرێن وەکو سزای زیناکارو بوختانچی و دزو مەی خۆر، بەڵکو لەسایەو سێبەری دیموکراسیەتدا ئەمانە پێستیان نەرم دەبێت و بازاڕیان گەرم، چونکە لەلایان نامینێ کەمترین حەیاو شەرم .بگرە هەر لەسایەی دیموکراسیەتدا زۆرێک لەمانە دەگەن بەئەنجومەنی نوێنەران و پلەکانی دەسەڵاتیش، چونکە لەیاساکانی دیموکراسیەتدا هەموو کەسێک بۆی هەیە خۆی هەڵبژێرێ بۆ پۆستەکانی دەسەڵات و بڕیاردان "بەڵام سەیر لەوەدایە کە هەندێ لەموسڵمانی ساویلکەو نەزانن لەگەڵیان بەشدار دەبن، گوایە بەمەبەستی ئەوەی لەنێو ئەم بناغە بەتاڵەو ئەم کۆمەڵە داڵە، شتێک لەئیسلام بەبڕیار بکەن، بەڵام (**أنى لهم ذلك**)؟"

هەروەکو ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :-

**قومٌ تراهُم مهطعين لمجلس فيه الشقاء وكُلُ كُفرٍ دان**
**بل فيه قانون النصارى حاكماً من دوُنِ نصٍ جاء في القران**
**تباً لهم من معشرٍ قد أشربوا حُبَ الخلاف ورشوة السلطان**

هەروەها لەباسی ئەو ڕۆژئاوایەی کە هەندێ موسڵمانی ساویلکەش بە دیموکراسیەکەی ئاڵوودەبوون ، شاعیر دەڵێ :

**الغربُ مقبرة العدالة كُلَما رُفعت له يَدٌ أبدى لها السكينا**

**الغرب مقبرة المبادئ لم يزل يرمي بسهم المُغرياتِ الدينا**

**الغربُ يكفر بالسلام وإنما بسلامه الموهومِ يستهوينا**



كفرٌ وإسلامٌ فأنى يلتقي هذا بذلك أيُها اللاهونا

أنا لا ألومُ الغربَ في تخطيطهِ ولكن ألومُ المسلمَ المفتونا

وألومُ أمتنا التي رحلت على درب الخضوع تُرافق التنينا

واتە /

ڕۆژئاوا گۆڕستانی دادگەر بیە هەرکاتێ دەستێ بەرزبوو چەقۆی تێ دەگرێ
ڕۆژئاوا گۆڕستانی بیروباوەڕەکانە ئێستاش بۆ ئایین لەپیلانگێڕانە
ڕۆژئاوا بڕوای نیە بەئاشتی بەلام بەئاشتی یە خەیاڵاویەکەی چاومان دەبەستێ
کوفرو ئیسلام چۆن بەیەک ئەگەن بۆتێناگەن، خۆتان گێل ئەکەن
نا من گلەیی ناکەم لە ڕۆژئاوا بەڵکو لەموسڵمانێ کە هەڵخەڵەتاوا

هەندێکی تریش لەوانەی خۆیان بەموسڵمان نیشان دەدەن، کەچی بۆهەموو یاساو بڕیارێکی دژ بەئیسلامیش دەست هەڵدەبڕن، بۆ دەسەڵاتی هەموو تاغوت و ستەمکارێکیش ڕەزامەندی دەردەبڕن، هەروەکو مەودودی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: ـ (**ومن مظاهر النفاق أن يدعي الانسان الايمان با لاسلام، ويتظاهر بالانتساب إليه والتمسك به، ثم يعيش راضياً مطمئناً في ظل نظام مناقض للذي يؤمن به، قانعاً مغتبطاً في كنفه، لا ينبض له عرق، ولا يخفق له قلب، إن مثل هذا الصنيع من أمارات النفاق ومن صميمه من غير الشك** )[1].

واتە: لەشێوازەکانی دووڕوویی ئەوەیە کە کەسێک بانگەشەو لافی ئەوە لێبدات کە باوەڕی بەئیسلام هەیە و موسڵمانە و زۆر پابەندیشە بەئایین، ئینجا لەهەمان کاتدا بەئاسوودەیی ڕازی بێت و ژیان بەسەرببات لەژێر سێبەری بەرنامەیەک کە دژو پێچەوانەیە

(١) **تذكرة دعاة الاسلام** / ٧.

لەگەڵ ئەوەی ئەو باوەڕی پێ هەیە، لەژێر ئەم دەسەڵاتەدا هیچ دەمارە خوێنێکی بۆ ئایین و باوەڕەکەی نەجولێ و دڵی بۆی لێنەدات، بەڕاستی ئەم جۆرە کارە لەنیشانەکانی دووڕوویی و ناوەڕۆکیەتی بەبێ گومان .

هەرچەندە حوکم نەکردن بەقورئانی پیرۆز دوو جۆری هەیە، کە جۆرێکیان بریتیە لەوەی دەسەڵاتدار کەسێکی موسڵمان و پابەند بەبریارو ڕێنماییەکانی خودای گەورە بێت، بەڵام لەبابەتێک یان کێشەیەک سەرپێچی بڕیاری خودا بکات و بەپێی بۆچوون و ئارەزووی خۆی بڕیار بدات، لەگەڵ ئەوەشدا بزانێ کە بڕیاری قورئان و فەرموودە پێویستە جێ بەجێ بکرێ، کە بەپێی ئارەزووی خۆی جولاوە دان بەوەدابنێت کە تاوانبارەو شایستەی سزادانە، هەر لەسەر ئەم جۆرەیە کە زانایانی پێشینە چاکەکانمان لەراڤەی ئایەتی :

{وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} المائده: ٤٤

لەوانە ابن عباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی : -(**كفر لاينقل عن الملة**)واتە: کوفرێکە پێ لەئیسلام دەرناچێ، وە زاناو زاهیدی تابعی **عطائي** کوڕی ئەبی ڕەباح (ڕەزای خوای لێ بێ)فەرموویەتی : (كفر دون كفر) واتە : کوفرێک کە بچووکترە لەکوفری گەورە، وە هاوڕێ و هاودەمی أبن عباس، **طاووسي** کوڕی کەیسانی یەمەنی (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویەتی: - (**ليس بكفر ينقل عن الملة**) واتە: ئەو کوفرە نیە کە پێ لەئیسلام دەربچێ، وە کاتێ چەند کەسێک لە **ئیباضیە کان** کە تاقمێک بوون لەخەوارجەکان هاتنەلای ئەبی مجلز (ڕەزای خوای لێ بێ) و پرسیاریان لێکرد لەبارەی {وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} {*فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ*} {*فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ*} ؟

ئەبو مجلز فەرمووی : **إنهم يعملون بما يعلمون - يعني الأمراء - ويعلمون أنه ذنب....**)

واتــە : ـ ئەمانــە (فــەرمانڕەواکان) کاردەکــەن بــەوەی دەزانــن، لەوەشدا دەزانن کەتاوانە کاتێ کاریان پێ نەکرد ) [1]..

هەروەها ابن تيميه(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ : ـ (**أما مـن كان ملتزماً لحكم الله ورسوله باطناً وظاهراً، لكن عصى واتبع هواه، فهذا بمنزلة أمثاله من العصاة**) [2].

واتە : بەڵام ئەو کەسەی پابەندو پەیڕەوکارە بۆ حوکمی خوداو پێغەمبەرەکــەی (ﷺ) لــەدەروون و دەرەوەی، بــەڵام سەرپێچــیەکی کــردو شــوێن ئــارەزووی کــەوت، ئەمــە لــەڕیزی هاوشــێوە سەرپێچــی کارەکانی خۆیەتی .

ئینجا ابـن تيميـه (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێ)کـە لـەنێوانی سـەدەی شەشــەم و حەوتــەمی کۆچیدا ژیــاوە بەتایبــەتی لەســەردەمی کۆتــا خەلیفەی عەبباسی (المستعصم) ئاگاداربووە کەلـەم کاتانـەدا چ گونــاهو تــاوانێکی زۆر لـــەنێو جیهـــانی ئیســـلامی بڵـــاوبوبۆوە، بەڕاددەیــەک ڕابــواردن و هــەوەس بــازی گەیشــتبووە نــاو زۆربــەی کاربەدەست و سەربازانی خەلیفە، وەکو لێشاوێکیش بـەناو شـەقام و کۆڵانەکانی شاری بەغداد بڵاو بوبوونە وە، کە لـەتوانای خەلیفـە نــەمابوو پێشــی لــێ بگرێــت، بــێ گومــان سەرچــاوەی هــەڵکردن و هـەناردنی ئـەم فیتنـەو فەسادە بـۆ نێـو وڵاتـانی ئیسلامی جولەکـەو نەصــرانیەکان بــوون، کــە ســەد لەســەد وەکــو ئێســتا هــەموو هــەوڵێکیان خســتبووە گــەڕ بــۆ بــەلاڕێ دابــردن و بــەنج کردنــی گەنجی موسڵمان بەمەستی و کاری بـەد ڕەوشتی، هـەروەکو دکتـۆر علـی محمـد صلابی ((بـاس لـەوەدەکات کـەوا چۆن لەبەغـدا لـەنێو فەرمانڕەواکان و کاربەدەستانی وڵات مـەی خواردنـەوە بڵاوبو بۆوە و جێگــاو شــوێنی تایبــەتی بۆکرابــۆوە و هــەموو ئــەو پیــاوو ئافرەتانــەی لەم شوێنانە کاریان دەکرد جولەکـەو نەصرانی بـوون و زۆرپــەرۆش بوون لەوەی ئەم دیاردانـەی مـەی خواردنـەوەو گـۆرانی و هـەوەس بـازی

---

(١) سه يرى **نواقض الايمان القولية والعملية** بكه ٣٣٢.

(٢) منهاج السنة (١٣١/٥).

لەگەڵ ئافرەتی بێگانە بڵاوبێتەوە، بەتایبەتی ووتنی هۆنراوەو ئاوازی ئارەزووبزوێن کە وای لەگەنجەکان دەکرد تەنها بیر لەتێرکردنی سک و دامێن بکەنەوە، بۆ ئەوەش زۆر لەجەژن و ئاهەنگەکانیان هێنابووە ناو موسڵمانان و تێکەڵاوی و بەربەرەڵاییەکی زۆری تێدا ڕوودەدا، وەکو جەژنی لەدایک بوونی مەسیح و سەری ساڵ و چەند جەژنێکی تر وەکو جەژنی (نەورۆز)، ئینجا سەرەڕای شوێنەکانی حەوانەوەو تەلارە بەرزەکان، لەوانەش ئافرەتانی ئەفریقی و تورکی و سینی و ئەرمەنی و هی تر، تا وای لێهاتبوو کە گەنجان لەبەر ئەم ئافرەتانە بیریان لەپێک هێنانی خێزان لەگەڵ ئافرەتانی موسڵمان نەدەکردەوە، بەرادەدەیەک شوێنی ئافرەتە زیناکەرەکان دیاربوو، لەمەش زیاتر بەڵکو پەیوەندی خۆشەویستی نێوان ڕەگەزی هاوشێوەش دەبینرا، لەم هەوەس بازی و ئاهەنگە شەوانانەشدا خەڵکێکی زۆر کۆدەبوونەوە و پارەیەکی زۆری تێدا بەفیڕۆ دەدرا، تا جارێکیان خەلیفە نامەیەکی نارد بۆ بدرالدین لۆ لوئی فەرمانداری شاری موسڵ و تێیدا داوای لێدەکرد کە کۆمەڵێک لە کەیف زادەو چەنەبازەکانی بۆبنێرێت، لەهەمان کاتیشدا نوێنەری هۆلاکۆ گەیشتەلای بدرالدین و داوای مەنجەنیق و ئامێری گەمارۆدانی

لێدەکرد، بۆیە بدرالدین ووتی : سەیری ئەم دوو داوایە بکەن و زۆر بۆ ئیسلام و موسڵمانان بگریێن)) [1].

پرسیار ئەوەیە ئایا ئەوەی ئەوکات لەتاوان و بەد ڕەوشتی بڵاوبۆوە ئێستاش بەهەمان شێوە، بەڵکو زیاتریش بەربڵاو نیە ؟

بەڵام جیاوازی گەورە و ئاشکرا لەنێوان دەسەڵاتدارەکانی ئەوکات و دەسەڵاتدارانی ئەم سەردەمە ئەوەیە کە ئەوان موسڵمان بوون و لەزۆربەی کاروبارەکان پابەندی یاساو بڕیارەکانی خودا بوون، بەڵام لەم تاوانانە سەرپێچی کاربوون و خۆشیان دانیان بەم سەرپێچیە دادەنا، کەچی دەسەڵاتدارانی ئەم سەردەمە لەبناغەدا

(١) دوله المغول والتتار/ للصلابی . بەکورتکراوەیی ٤٤ – ٤٩.

دروستکراوو دانراوی جولەکەو نەصرانیەتن، ئینجا زۆربەیان ئەم نۆکەری و خزمەتکاریەیان بەئاشکرا دەربڕیوەو بگرە شانازیشی پێوە دەکەن، هەروا زۆرجار کوفری ئاشکراو ڕاشکاویان لێ بیسراوەو بینراوە، لەوەی کەوا گوایە ئایین هۆکاری پێش نەکەوتن و پاشکۆیی یە، وەیان ئایین مافی ئافرەتی پێشێلّ کردووە، وەیاخود ئایین ئازادی تاکەکەسی بەرتەسک کردۆتەوە، وەیان بڕیارەکانی قورئان بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێن ..هتد

{كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا} الكهف: ٥

بێ گومان کە دەڵێن ئایین تەنها مەبەستیان ئایینی ئیسلامە، چونکە تەنها ئایینی ئیسلامە کە ڕێگا نادات کەسانی وەک ئەوان ببێتە شوان و گاوان، چ جای ئاغاو دەسەڵاتدارو هامان ""

بۆیە تەنها ئیسلام بە مەترسی دەزانن لەسەر دەسەڵاتیان، بۆئەمەش پێیان خۆشە هەموو موسڵمانێک ببێتە جوو، نەصرانی، ئێزیدی، بەڵام پێیان ناخۆشە یەک جوو، نەصرانی، ئێزیدی ببێتە موسڵمان، هەربۆیە دەبینی مۆڵەت دەدەن بەدروست کردنی دەیان دێرو کەنیسەو لالش، بەگوژمەو پارەی دەوڵەت کە پارەی خەڵکی موسڵمانە، کەچی موسڵمانێک ئەگەر بەپارەی خۆی مزگەوتێک دروست بکات هەزارویەک ڕێگری لێ دەکەن "

ئینجا زۆر ماندووشن لە هەوڵەکانیان و هێنانەدی خەونەکانیان لە بەلاڕێ دابردن و بەنج کردنی گەنج، بەمەبەستی دزین و بردنی سامانی ووڵات و پڕکردنی بانقەکانیان لەووڵاتانی خەلیج و فەڕەنج .

نا، نەک هەرحوکم ناکەن بەیاساو بڕیارەکانی قورئان، بەڵکو بەئاشکرا ڕەخنەی لێ دەگرن و لەژێر ناوی گۆڕانکاری سەردەم و مەدەنیەت یاساو ڕێسای دەستکردی ڕۆژئاواییەکان لەشوێنێ دادەنێن، نا ، نەک هەر ئەمە بەڵکو سزاشیان داناوە بۆکەسانێک کە یاساکانی قورئان جێ بەجێ بکات، ئایا لەکارخستنی بڕیارو بەرنامەی خودا، لەکارخستنی ناوێک لەناوە جوانەکانی خوداو

سیفەتێک لەسیفاتە بەرزو تەواوەکانی نیە؟ مەگەر پێغەمبەر (ﷺ)نەیفەرمووە:

(**إنَ الله هو الحَكَمُ وَإليهِ الحُكمُ**)[1].

واتە : بەڕاستی خودا هەرخۆی دادوەرەو بۆ لای ئەویش دادوەری دەگەڕێندرێتەوە.

ئایا هاوبەش و هاوتا دانان بۆ خوای گەورە (سبحانه وتعالی)لەبەرنامەو بڕیارەکانی هیچ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ هاوبەش و هاوتا دانان بۆخوا لەپەرستنی دا ؟

مەگەر خوای بەرزی بێ هاوتا نەیفەرمووە :ـ

{ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا } الكهف: ٢٦

واتە: ـ خودا هیچ کەس ناکات بەهاوبەشی خۆی لەبڕیارو فەرمانی خۆیدا.

مەگەر هەر ئەویش نەیفەرمووە :ـ

{ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا } الكهف: ١١٠

واتە :ـ نابێ لەپەرستنی پەروەردگاریدا هیچ کەس بکات بەهاوبەشی .

بەڵکو هەردووکیان یەک شتن و یەک شێوازی هاوبەشی دانانن هەروەکو خوای گەورە لە ئایەتێکدا کۆی کردونەتەوە و پێی ڕاگەیاندووین کەوا دادوەری کردن بە بەرنامەو بڕیارەکانی خودا مانای بەندایەتی کردن و پەرستنی خودایە بەتاک و تەنهایی، هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ } يوسف: ٤٠

---

(١) **أخرجه أبو داود**(٤٩٥٥) **والنسائي** (٢٢٦،٢٢٧)**والبيهقي** (١٤٥/١٠)**وصححه الالباني في إرواء الغليل**(٢٣٧/٨)

واتە: بڕیارو فەرمانگەری تەنها بۆخوایە، فەرمانی داوە جگە لەو هیچ شتێ نەپەرستن، ئەوەیە ئاینی ڕاستەقینەی نەگۆڕ، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن .

بەڵێ ئەگەر زۆربەی خەڵکی لەم بوارەدا نەزان بن، کەواتە کەمێکیان دەرک بەم ڕاستیە دەکەن و بەیادو بیری خەڵکیش دەهێننەوە کەوا تەنها پەیام و شەریعەتی خوا شایستەیە پەیڕەوی بکرێ، چونکە هەر بەوە فەرمانمان پێکراوە، هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ـ

{ اتَّبِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ} الأعراف: ٣

چونکە بەشێوەیەکی ڕەها، بڕیارو بەرنامەی خوا چاکترین پەیڕەوو بڕیارە لای ئەوکەسانەی کە بڕوای ڕاست و ڕۆچوویان هەیە، خودای گەورە دەفەرمووی:ـ

{وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ} المائدە: ٥٠

واتە : ئایا کێ حوکم و بڕیاری لەهی خوا جوان و چاکترە ؟

لەبەرمبەریشدا هەربڕیارو بەرنامەیەکی تر کە دەستکردو دانانی مرۆڤە، خراپ و پڕ کەم و کوڕیە، چونکە زادەی بیری بەرتەسک و سنوردارو، هەڵقوڵاوی هەوەس بازی و ئارەزوومەندی نەفسی بەدکارە، بۆیە پێچەوانەن لەگەڵ بڕیارەکانی خودا .

{ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ } القصص: ٥٠

واتە: کێ لەوکەسە گومڕاترە کەشوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت بێ ڕێنموونی لەلایەن خواوە، کە بێگومان خودا ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات .

ئینجا کەسێک نەیەت و بڵێ ئەمە نەفسی بابای بێ باوەڕە، موسڵمان وانیە، بەڵکو خودا فەرمانی بەپێغەمبەرانکردووە کە شوێن ئارەزووەکانیان نەکەون لەبڕیارداندا، چ جای موسڵمانی ئاسایی ! خودا دەفەرمووێ :

{يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ} ص: ٢٦

واتە: ئەی داود ئێمە تۆمان کرد بەجێ نشینی پێغەمبەرانی پێش خۆت لەزەوی جا لەنێوان خەڵکدا بەهەق فەرمانڕەوایی بکەو شوێن هەواو ئارەزووت مەکەوە با لەڕێگای خوا لات نەدات، بێگومان ئەوانەی لەڕێگای خوا لادەدەن و گومڕا دەبن سزای سەختیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیرکردووە .

هەروەکو پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ)لەلایەن خوداوە قەدەغەکرابوو کە شوێن هەواو ئارەزووەکانی بێ باوەڕان بکەوێ، چونکە سەرەنجامەکەی لاڕێی و گومڕایی یە، خوای گەورە دەفەرمووێ : ـ

{قُلْ لَا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ} الأنعام: ٥٦

واتە : بلێ من شوێن هەواو ئارەزووەکانتان ناکەوم، چونکە بێ گومان ئەوکاتە گومڕا دەبم و نابم بەکەسێک لەوانەی ڕێنموویی کراون.

بەڵام خودا پێغەمبەرەکەی پاراست، هەروەک دەفەرمووێ : ـ

{وَلَوْلَا أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا} الإسراء: ٧٤

واتە: خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەکردایە، نزیک بوو تۆ کەمێک بەلایاندا بچی لەبەر پەرۆشیت بۆ باوەڕهێنانیان .

{إِذًا لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا} الإسراء: ٧٥

واتە: ئەگەر بەلای ئارەزووەکانیان بچوبای ئەگەر کەمێکیش با، ئەوکاتە لەژیاندا دووبەرانبەر سزامان دەدای، لەپاش مردنیش دووبەرانبەر سزامان دەدای پاشان لەلای ئێمە هیچ ڕزگارکارێکت دەست نەدەکەوت کە لەسزاکە بتپارێزێ و ڕزگارت بکات .

کەواتە باوەڕداران دەبێ نرخ و پایەی ئەو هەقە بزانن کە لەلایتیان لەوەشدا دەبێ خەڵک شوێنکەوتەی ئەوان بێ، نەوەک

ئەوان شوێن هەواو ئارەزووی بێ باوەڕو دونیا پەرستان بکەون، خۆ ئەگەر هەق شوێن ئارەزووی بێ باوەڕان کەوت ئەوا بوونەوەرو ژیانی سەرزەوی تێک دەچێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ} المؤمنون: ٧١

مجاهد و ابو صالح و السدی دەفەرموون :ـ (**والمراد لو أجابهم الله إلى مافي أنفسهم من الهوى، وَشَرَعَ الامورَ على وفق ذلك لفسدت السماوات والأرض ومن فيهن أي لفساد أهوائهم وأختلافها**) (١)

واتە : ئەگەر خوای گەورە وەڵامیان بداتەوە بۆئەوەی لە دەروونیان دایە لەهەواو ئارەزوو، بڕیارو فەرمانەکانی لەسەر هەواو ئارەزووی ئەوان دابڕێژێ ئەوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تیایاندایە تێک دەچێت و خراپ دەبێت، چونکە ئارەزووەکانیان خراپەو جۆراوجۆرە.

خودای گەورەش فەرمانی بەهەموو پێغەمبەرانی خاوەن بڕیارو خۆڕاگر (أولی العزم) کردووە، بەتایبەتی پێغەمبەری پێشەوا محمد (ﷺ)کەوا بڕیارەکانی ئایین دابمەزرێنن لەنێو خەڵکی و ڕاجیایی و پەرتەوازە نەبن تێیدا، هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{ شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ ۖ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ}الشوری: ١٣

هەروەکو شێخ ابن عاشور دەفەرمووێ :ـ (**شرع لكم وجوب إقامة الدين الموحى به وعدم التفرق فيه**) (٢)

واتە : بڕیاری بۆتان داوە لەپێویستی دامەزراندن و پەیڕەوی کردنی ئەو ئایینەی سروشی پێ کراوە و پەرتەوازە نەبن تێیدا.

بەڵام ئەم بڕیارەی خوداو ئەم بانگەوازەی پێغەمبەر (ﷺ)زۆر قورس و گرانە لەسەر ئەو بێ باوەڕانەی هەواو ئارەزووەکانیان

(١) تفسير ابن كثير (٢٢٣/٣)..

(٢) **تفسير التحرير والتنوير**(٥١/١٠)..

کردۆتە هاوشێوەو هاوتای بەرنامەکەی خوا لەبڕیارویاساکانی ژیان بۆیە ئامادەنین شوێنکەووتووی بەرنامەی پێغەمبەران بن، هەروەکو پاشان خودای پەروەردگار دەفەرمووێ :ـ

{كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ} الشورى: ١٣

ابن تيميه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : ـ (**فأخبر أن الذي يدعو إليه المرسلون كبر على المشركين، فما الناسُ إلَا تابعُ لهم أو مُشرِك، وهذا حقٌ لاريب فيه**)[1] .

واتە: خودای گەورە هەواڵی داوە کەوا ئەو ئایینەی پێغەمبەران (عليهم السلام)بانگەوازی بۆئەکەن زۆرگرانە لەسەر موشریکەکان، بۆیە خەڵک یان شوێنکەوتووی پێغەمبەران دەبن یان موشریک، ئەمەش ڕاستیەکە گومانی تێدانیە .

جا ئەگەر موشریکەکان ئامادەنەبوون شوێنکەوتووی پێغەمبەران بن، دەبێ باوەڕداران ڕشت ترو سوورتر بن لەگوێڕایەڵی نەکردنیان و شوێن نەکەوتنی هەواو ئارەزووەکانیان، بەڵکو لەکەمترین ناکۆکی و بچووکترین جیاوازی دەبێ باوەڕدار بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی ئایینەکەی ئەگەر بڕوای بەخوداو دوا ڕۆژی هەیە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :

{وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ} الشورى: ١٠

هەروەها دەفەرمووێ :

{فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا} النساء: ٥٩

ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)لەبارەی ئەم ئایەتە دەفەرمووێ :ـ (( **إن قوله (فإن تنازعتم في شيء) نكرة في سياق الشرط، تَعُمُ كل ماتنازع فيه المؤمنون من مسائل الدين دقه وَجلّه، جلّيهِ وخفيّهِ، ولو لم يكن في كتاب الله ورسوله بيان حكم**

---

[1] **الصارم المسلول** /٢٥٠.

**ماتنازعوا فيه، ولم يكن كافياً لم يأمر بالرد إليه، إذ من الممتنع أن يأمر تعالى بالرد عند النزاع إلى من لايوجد عنده فصل النزاع، ومنها أنه جعل هذا الرد من موجبات الإيمان ولوازمه، فإن انتفى هذا الرد انتفى الأيمان،ضرورة انتفاء الملزوم لانتفاء لازمه))** [١]

واته: فەرمایشتی (فإن تنازعتم فی شیء) نەناسراوە لەشێوازی مەرجدا، کەوابوو هەموو ئەوشتانە دەگرێتەوە کە باوەڕداران تێیدا ناکۆکن لەبابەتەکانی ئایین، بچووک و گەورەی، هەروا ئاشکراو نادیارەکانیشی، جا ئەگەر لەقورئانەکەی خوداو سوونەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕوونکردنەوەی بڕیار نەبوایە لەوەی تێیدا ناکۆکن، وە بۆیان بەس نەبوایە، فەرمانی نەدەکرد بەگەڕانەوە بۆی، چونکە ناگونجێ خودای گەورە فەرمان بکا لەکاتی ناکۆکی بەگەڕانەوە بۆلای کەسێ کە بڕیارو چارەسەری یەکلاکەرەوەی لەلا نەبێ، هەروەها ئەم گەڕاندنەوەی کردووە بەپێویستی هەبوونی باوەڕ، جا ئەگەر ئەم گەڕاندنەوە نەبوو ئەوا باوەڕەکەش نامێنێ، چونکە ئەوشتە نەما کە لەبوونی باوەڕدا پێویستە هەبێ.

هەروەها ابن **كثير**(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)لەم بارەیەوە دەفەرمووێ:

- **(فدل على أن من لم يتحاكم في محل النزاع الى الكتاب والسنة ولايرجع اليهما في ذلك، فليس مؤمناً بالله ولا باليوم الاخر)** [٢]

واته: ئەمەش ئاماژەیە بۆئەوەی هەرکەسێک لەکاتی ناکۆکی دادوەری نەکا بۆلای قورئان و سوننە و نەگەڕێتەوە بۆلایان، ئەوا باوەڕی نیە بەخوداو ڕۆژی دوایی.

---

(١) اعلام الموقعين (٤٩/١ – ٥٠).

(٢) تفسير ابن كثير (٢٠٩/٣).

سەیریش لەوەدایە کە هەندێ لەموسڵمانان زۆرپێداگری دەکەن لەمەترسی و گەورەیی شیرک و هاوەڵ دانان بۆ خودا لەپەرستنی دا، کەچی بەهیچ شێوەیەک و نەبەزۆرو نەبەکەم خۆ بەلای شیرک و هاوەڵ دانان لەبڕیارو فەرمانڕەوایی خودای گەورەدا نادەن و باسی ناکەن، ئەگەرچی هەردووکیان یەک شتن و مەترسی هیچ یەکێکیان لەوەی تر کەمترنیە، هەروەکو شێخ محمد بن المختار **الشنقيطي**(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ

**(الإشرك بالله في حكمه، والإشراك به في عبادته كلها بمعنى واحد، لا فرق بينهما البتة، فالذي يتبع نظاماً غير نظام الله، وتشريعاً غير تشريع الله، كالذي يعبد الصنم ويسجد للوثن، ولا فرق بينهما البتة بوجه من الوجوه، فهما واحد، وكلاهما مشرك)**[1].

واتە :

هاوەڵ دانان بۆ خودا لەبڕیارو فەرمانەکانی، هاوەڵ دانان بۆی لەپەرستنی دا هەمووی یەک مانای هەیەو هیچ جیاوازی نیە لەنێوانیان، جا ئەوکەسەی شوێن بەرنامەیەک دەکەوێ جگە لەبەرنامەی خواو پەیڕەوی یاساگەلێک دەکات جگە لەیاساکانی خوا، وەکو ئەوکەسە وایە کە پەیکەرێک دەپەرستێ و سوژدە بۆبتێک دەبات، هیچ جیاوازی نیە لەنێوانیان لەهیچ ڕوویەکەوە، چونکە هەردووکیان موشریکن .

ئینجا زاناو ڕاهیبەکانی جولەکەو نەصرانیەکان کاتێک بڕیارو یاساکانی خوای گەورەیان گۆڕی لەحەرام کردنی حەڵاڵەکان و حەڵاڵ کردنی حەرامەکان بۆ بەرژەوەندی دونیایی خۆیان، بۆنەوەی ئیسرائیل خۆیان کرد بەهاوەڵی خودا لەبڕیارو یاساکانی، نەوەی ئیسرائیلیش لەوەدا کافربوون کە دانیان نا بەبڕیارو یاساکانیان و پەیڕەویان کردو گوێڕایەڵیان کردن،

---

(١) اضواء البيان(١٦٢/٧).

هەروەکو لەفەرموودەی عەدی کوڕی حاتەم[*] هاتووە کە کاتێک دێتەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)گوێ ی لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)دەبێ کە ئەم ئایەتەی بەسەردا دەخوێنێتەوە {اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ} التوبه: ٣١ .

دەفەرمووێ : ووتم: خۆ ئێمە نەمانپەرستوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا حەڵاڵیان لێ حەرام نەدەکردن ئێوەش بەحەرامتان دەزانی؟، ئایا حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردن و ئێوەش بەحەڵاڵتان دەزانی ؟ دەڵێ : ووتم: بەڵێ ڕاستە. فەرمووی جا ئەمەیە پەرستنیان بۆیان[1]..

بێگومان خەڵکی ئەوکاتیش هیچ جۆرە پەرستنێکی وەک نوێژو ڕۆژو بۆ ئەم زاناو ڕاهیبانە ئەنجام نەدابوو، بەڵکو تەنها بەمە بوونە موشریک کە گوێڕایەڵیان کردن لەحەرام کردنی حەڵاڵ و حەڵاڵ کردنی حەرامەکان، خوای گەورەش ئەوەی بەشیرک لەقەڵەم دا هەروەک لەکۆتایی ئایەتەکەدا فەرمووی :-

{ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ} التوبه: ٣١

بەڵام لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەوکەسانەی بڕیارو یاسا دەردەکەن، سەرەڕای بەرژەوەندی دونیایان، مەبەستیان ناشیرین کردنی بەرنامەی خواو جوان کردنی بەرنامەی ڕۆژئاوایە، بۆیە زۆر بەڕاشکاوانە دێن و ڕەخنە لەبڕیارەکانی قوڕئان و یاساکانی ئیسلام دەگرن، لەژێر بیانووی پێشکەوتنخوازی داوای لابردنیان دەکەن، ئەمەش بەبەرنامەیەکی داڕێژراوو درێژخایەن، بۆئەوەی وورده وورده گەورەیی ئایین لەدڵی خەڵک و یاساکانی قوڕئان لەژیانی خەڵک دەربهێنن، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئوممەتەکەی لەپیلانی ئەم دوژمنانە ئاگادارکردۆتەوە، هەروەکو لەفەرموودەی أبی ئومامەی

---

(*) عدی کوڕی حاتەم ئەوکات نەصرانی بووە، وە بەپێی یەکێک لەریوایەتەکان لەم کاتەدا خاچێکی لەملی بووە

(١) أخرجه الترمذي (٣٠٩٥) والبيهقى (١١٦/١٠) وحسنه الالباني.

باهلی (ڕەزای خوای لێ بێ) دا هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی :ـ

(**لتنتقض عُرى الاسلام عروة عروة، فكلَما إنتقضت عروة، تَشَبَّثَ الناسُ بالتي تليها، وأولهُن الحُكمُ، واخرهُنَ الصلاة**)[1].

واتە : سوێند بەخوا گرێ و قولفەکانی ئیسلام هەڵدەوەشێندرێتەوە گرێ لەدوای گرێ، جا هەر کەگرێ و قولفەیەک هەڵوەشایەوە، خەڵکی دەست دەگرن بەوەی دوای ئەو، یەکەم گرێ و قولفەش کە هەڵدەوەشێندرێتەوە بڕیارو فەرمانڕەوایی یە، دواییینیشیان نوێژە .

بێ گومان سەرەتای هەڵوەشانەوەی هەموو قولفەکانی ئیسلامیش کە ئەوانی تری پێوە بەستراوەتەوە فەرمانڕەوایی کردنی بڕیارەکانی قورئان و سوننەیە، هەربۆیە تاغوتەکان هەوڵەکانیان زیاتر لەم بوارەدا چڕکردووە، هەروەکو صلاح الصاوی دەفەرمووێ :ـ

(( تاغوتەکان – لەکۆن وئێستادا – ململانێیان کردووە لەدژی خودا لەمافی بڕیارەکان بەکردن و نەکردن (**الامر والنهي**) و یاسا دانانێک بەبێ دەسەڵاتی خودای لەسەربێ، جا سەرەتا زاناو ڕاهیبەکان بانگەشەی ئەم مافەیان کرد بۆخۆیان، بەمەش حەرامیان حەڵاڵ کردو حەڵالیشیان پێ حەرام کردو بەهۆیەوە باڵادەست بوون بەسەر بەندەکانی خوا، بەمەش بوون بەپەرستراو جگە لەخوا، پاشان پاشاکان لەسەر ئەم مافە ململانێیان کرد لەگەڵیان تا کار گەیشتە ئەوەی دەسەڵات دابەش بکەن لەگەڵ ئەم ئەحبارو ڕاهیبانە، پاشان عەلمانیەکان هاتن و ئەم مافەیان لەهەردوولا ستاندو گواستیانەوە بۆ دەستەو دەزگایەک کەنوێنەرایەتی گەل دەکات و ناویان لێنا پەرلەمان یان ئەنجومەنی نوێنەران))[2].

---

(١) أخرجه احمد (٢٣٢/٤) والحاكم (٩٢/٤) وصححه..

(٢) نظرية السيادة وأثرها على شرعية الأنظمة الوضعية/١٩٠.

کەواتە ئەوانەی سەرەتاو یەکەم گرێ و قولفی ئایینی ئیسلام لەنێو ژیانی خەڵکدا هەڵدەوەشێننەوە بەوەی بڕیارو بەرنامەیەکی دەستکرد لەجێگای دابنێن، بێ گومان ئەمانە باوەڕدارنین، بالاف و گەزافی باوەڕداریەتیش لێبدەن، هەروەکو **سید قطب** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ (**فما يمكن أن يجتمع الإيمان، وعدم تحكيم شريعة الله، أو عدم الرضى بحكم هذه الشريعة، والذين يزعمون لأنفسهم أو لغيرهم أنهم مؤمنون، ثم لايحكمون بشريعة الله في حياتهم، أو لايرضون حكمها إذا طبق عليهم.. إنما يدعون دعوى كاذبة، وإنما يصطدمون بهذا النص القاطع** {وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ} المائدة: ٤٣[(١)].

واتە : ناگونجێ باوەڕو حوکم نەکردن بەبەرنامەی خوا لەکەسێکدا کۆببێتەوە، یان ڕازی نەبێ بەحوکمی ئەم ئایینە، وە ئەوانەش کە بۆخۆیان یان بۆکەسانی تر لافی ئەوە لێدەدەن کە باوەڕدارن، پاشان حوکم بەبەرنامەی خوا ناکەن لەژیانیاندا، یان ڕازی نین لەسەریان جێ بەجێ بکرێ، بەڕاستی بانگەشەکەیان درۆیە، وە ڕووبەڕووی ئەم دەقە یەکلاکەرەوە دەبن کە دەفەرمووێ: ئەمانە باوەڕدارنین.

وەیان هەندێکیان دەڵێن : ئیسلام باسی گۆڕانکاریەکانی سەردەمی تێدانیەو پێویست دەکات بڕیار گەلێک بۆ ئەم بابەتە هەنوکەییانە دابڕێژین،

لەم بارەشەوە أحمد شاکر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ (**والقرآن مملوء بأحكام وقواعد جليلة، في المسائل المدنية والتجارية، وأحكام الحرب والسلم وأحكام القتال والغنائم والأسرى وبنصوص صريحة في الحدود والقصاص فمن زعم أنه دين عبادة فقط، فقد أنكر كل هذا، وأعظم على الله الفرية، وظن أن لِشخصٍ كائناً من كان، أولهيئة كائنة من كانت، أو**

---

(١) في ظلال القران (٢/٨٩٥). .

**تنسخ ما أوجب الله من طاعته والعمل بأحكامه، وما قال هذا مسلم ولايقوله، ومن قاله فقد خرج عن الاسلام جملة، ورفضه كله، وإن صام وصلى وزعم أنه مسلم)**[1] .

واتە : قورئان پڕە لە بڕیارو بنچینەی مەزن، لە بابەتە شارستانی و ئابووریەکان، هەروا بڕیارەکانی جەنگ و ئاشتی و یاساکانی کوشتارکردن و دەستکەوت و دیلەکان، وە بەدەقی ڕاشکاو لە سزاسنووریەکان و تۆڵە سەندنەوە، جا هەرکەسێک وا گومان ببا کە ئیسلام تەنها ئایینی خواپەرستی تاکەکەسیە، ئەوا ئەمانەی هەموو ڕەتکردۆتەوەو ناڕاستیەکی گەورەی بەسەر خوادا ووتووە، ئەگەر پێی وابێ کەسێک (با هەرکەسێک بێ) یان دەستەیەک (با هەردەستەیەک بێ) بۆی هەیە ئەوەی خودا پێویستی کردووە لەگوێرایەڵی کردنی و کارکردن بەبڕیارەکانی لایبدات، هیچ موسلمانێکیش ئەمەی نەووتووە و نایڵێ، هەرکەسێکیش ئەمە بڵێ ئەوا لەئیسلام چووەتە دەرەوە بەگشتی و هەمووی ڕەتکردۆتەوە، با بەڕۆژووش بێ و نوێژ بکات و پێی وابێ کە موسڵمانە .

خودای زاناو کاربەجێ دەفەرمووێ :ـ {وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ } الزخرف: ٨٤

واتە : ئەوخودایە لەئاسماندا پەرستراوەو لەزەویشدا پەرستراوە هەر ئەویش کاروبڕیارەکانی پڕە لەحیکمەت چونکە لەزانست و شارەزایی تەواویەتی. مەگەر نابینن ((ئەو ئاسمانەی کە ئێمە لەژێریاین و ئەستێرەکانی بەسەرمانەوە دیارن هەمووی لەنێو یاساو ڕێسایەکی گەردوونی ڕێک و پێکدا دەخولێنەوە (بەئێمەشەوە کە خەڵکی سەرزەوین) پێیان دەووترێ: کۆمەڵەی خۆر، (**المجموعة الشمسية**) هەرهەموومان دەخولێینەوە بەدەوری چەقی مەجەڕڕەی

(١) عمدة التفسير لابن كثير تعليق لأحمد شاكر (١٧١/٢ – ١٧٢)..

(**الطريق اللبني**) یان (**درب التبانة**) کە زیاتر لە (١٣٠) بلیۆن ئەستێرە لەخۆ دەگرێ)) [(١)].

هەمووشیان لەژێر یاساو بەرنامەی خودا فەراهەم کراون، هەر لەدروست بوونیان، پاشان هەم لەجوڵەو خولانەوەی بەردەوامیان، وەک خوا دەفەرمووێ : {وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ } الأعراف: ٥٤

ئینجا ئەو ڕۆژو مانگ و ئەستێرانەو ئەو مەلائیکەتانەش کە لەئاسمانی دونیاو ئاسمانەکانی تردا هەن هەمووی کڕنووش بۆ خودا دەبەن {وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ } الإسراء: ٤٤

ئەی خاوەن هۆش و بیرمەندەکان وەرن با وانەیەک وەرگرین لەو مێشەنگوینەی پەیڕەوی یاساو بڕیارەکانی خودا دەکات لەژیانی ڕۆژانەی هەر لەدیاری کردنی شوێنی نیشتەجێ بوونی و نیشتمانی، جۆری خواردنی، چۆنیەتی گەڕانەوەی!! کاتێ خودا فەرمانی پێ دەکات : {أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ } النحل: ٦٨. ئەم بڕیارەی جێ بەجێ کردووە و تائێستا تەنها هەر لەچیاکان و دارەکان و خانووە دەستکردەکانی مرۆڤ ماڵ دادەنێ، پاشان { *ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ* } بخۆ لەهەموو گوڵەکان، بێ گومان ئەم بڕیارەشی جێ بەجێ کردووە، ئینجا { *فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا* } دەبینی دوای بڕینی چەندین کیلۆمەتر بەبێ هەڵەکردن دەگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی!! سەرەنجامی ئەم گوێڕایەڵیەو پەیڕەویەی مێشەنگوین بۆ بڕیارەکانی خوا ئەوەیە کە {يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ ۗ} النحل: ٦٩

،واتە: شلەمەنیەک لەسکی دەردەچێت (هەنگوین) ڕەنگی جۆراو جۆری هەیەو شیفای تێدایە بۆ خەڵکی .

خاڵی سەرنج لێرەدا ئەوەیە کە ئەگەر باوەڕدار وەکو مێشەنگوین بڕیارو بەرنامەی خودا پەیڕەوبکات و خەڵکی پابەند

---

(١) موسوعة الاعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهرة (٣٥٠).

بکرێ بەرێنماییەکانی ئیسلام ئەوا بۆ سەرجەم خەڵک دەبێتە شیفاو چارەسەری کێشەکانیان، چونکە ناکرێ خودا بەرنامەی ژیان بۆ باڵداریکی لاواز دارشتبێ و بەرێزترین دروستکراویشی کەمرۆڤە فەراموش کردبێ، هەربۆیە لەکۆتایی ئەم ئایەتانەدا دەفەرمووێ :ـ

{إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ } النحل: ٦٩

ئینجا پێغەمبەری خواش (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

( **مَثَلُ المؤمنِ مَثَلُ النحلةِ، لا تأكل إلَا طيباً ولا تضع إلا طيباً** ) [١]

واتە : نموونەی باوەڕدار وەک مێشەنگوینە، تەنها رزقی پاک دەخوا، بۆیە تەنها شتی پاکی لێ بەئەنجام دێ .

جا ئەمە نموونەی ئەو باوەڕدارەیە کە یاساو دەستوور تەنها لەپەروەردگاری خۆی وەردەگرێ و هەر لەسەر پەیامی خوداش دەژی و دەمرێ، بەڵام نموونەی ئەوانەی یاساو بەرنامەی دەستکرد هەڵدەبژێرن بەسەر بڕیارەکانی شەریعەتی خوا ئەوا نموونەیان وەکو ئەو مێش و مەگەزو ئاژەڵە درندانەیە کە تەنها لەسەر کەلاک و شتی پیس کۆدەبنەوە، هەروەکو دەڵێ (( **إنَ مثلُ مَن أستبدل بالشريعة القانون والدستور الوضعي مَثَلُ الجُعلِ يتأذى من رائحة المسك والورد الفواح، ويحيا بالعذرة والغائط في المستراح** )) [٢]

واتە : نموونەی ئەوکەسەی شەریعەتی خوا بەیاساو دەستوری دەستکرد دەگۆڕێتەوە وەکو قالۆچە وایە کە بەبۆنی خۆشی گوڵ و مسک تێک دەچێ، بەڵکو هەر بەپیسایی و پاشەڕۆ کەیفی دێ و لەسەری دەژیێ .خوای پاک و بەرزی بڕیار چاک دەفەرمووێ : ـ{

---

(١) حسن أو صحيح كما في السلسلة الصحيحة ٣٥٥.

(٢) الرسائل المنيرية (١٣٩/١) ..

أَلا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ، لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} النحل: ٥٩ – ٦٠

واتە : ئای لەچەوتی و خراپی ئەو بڕیارەی دەیدەن، بۆ ئەوانەی باوەڕییان بەڕۆژی دوایی نیە نمونەی خراپە، نموونەی هەرە بەرزیش هەر بۆ خودایە، ئەوخودایەی کردگاری بەتواناو کاربەجیٚ یە .

سەرەنجامیش هەر بۆ ئایین و بڕیارو بەرنامەی خودایە کە خاوەنداریٚتی خۆی بۆئاسمانەکان و زەوی هەواڵدایە {وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا ۚ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ} النحل: ٥٢

**أبو عبدالله نفطويه** (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) لە ڕاڤەی (**وله الدين واصِباً**).

دەفەرمووێ : **أي ثابتاً دائماً، فالمعنى له الحكم دائماً أبداً، وحُكم غيره زائل، فذلك ثبوت دين الله أنه باق وماسواه مضمحل**[1].

واتە : چەسپاوو بەردەوام، بەومانایەی بڕیارو بەرنامە بۆ خودایە بەبەردەوامی و تاهەتایە، وە بڕیارو بەرنامەی جگە لەو نامینیٚ، ئەمەش جیٚگیری ئایینی خوایە کە دەمیٚنیٚ و جگە لەو لەناودەچیٚ .

| | |
|---|---|
| مەینەتی و بەد بەختی یە | نەفامی و بیٚ هەستی یە |
| کەسیٚ لەم شەوە زەنگە | پشتکا لەم ڕووناکی یە |
| ڕێبازیکی پڕ سۆزە | شەوە کەی وەکو ڕۆژە |
| پڕ دادو یەکسانی یە | بۆ هەموو گەل و هۆزە |
| هەر ڕچی تێیدایە هەقە | قورئان و سوننە دەقە |
| دەستوری بەختەوەری یە | غەیری ئەو شەق و پەقە |
| هەر ڕچی دیموکراسی یە | دینی خۆپەرستی یە |
| دین لە دەولەت جیا دەکا | ئاکامیش نوشستی یە |

---

(١) تفسير نفطويه ١٠١ – ١٠٢، بصائر ذوي التمييز (٢٢١/٥)..

## دۆستایەتی کردن و دوژمنایەتی کردن لەبەر خودا

گرنگی و پێگەی ئەم بابەتە لەباوەڕدا زۆر گەورەو پڕ بەهایە چونکە بنچینەیەکی بەهێزی باوەڕو بۆتەیەکی دیاری تاقی کردنەوەیە لەڕاستی و ناڕاستی خۆخستنە ڕیزی باوەڕداران، هەروەکو خوای پەردوەردگار دەفەرمووێ:ـ

{وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ۚ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ ۞وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ} العنكبوت: ١٠- ١١

واتە : لەخەڵکیدا کەسانێک هەن دەڵێن باوەڕمان هێناوە بەخوا، ئینجا کاتێ سزابدرێن لەپێناوی خوا (لەلایەن کافرانەوە) ئازارو سزای خەڵکی وەکو ئازارو سزای خوا دادەنێن، وە ئەگەر سەرکەوتنێک بێت لەلایەن پەروەردگارەوە (بۆ باوەڕدارانی ڕاستەقینە) ئەوا دەڵێن بێ گومان ئێمە لەگەڵ ئێوە بووین، ئایا خوا زاناو ئاگادارتر نیە بەوەی لەناو دڵ و دەروونی هەموو کەسێک دایە ؟ سوێند بێ خوا چاک دەزانێ باوەڕداران کێن، وە چاک دەزانێ دوو ڕووانیش کێن ؟ کەواتە ئەو باوەڕەی لەدڵدا هەڵدەقوڵێ و ڕاستگۆیانە بەزوبان دەردەبڕدرێ، دەبێ گیان و لاشەی لەپێناودا بە کەم سەیربکرێ و چاوەڕوانی هەموو تاقی کردنەوەیەکی خوای لەسەر بکرێ ، ئەمە خاڵی جیاکەرەوەیە لەنێوان باوەڕی ئەوانەی خودایان خۆش دەوێ، نێوانی ئەوانەش کە تەنها لاف و گەزافی باوەڕ لێدەدەن.

ئەنجا کاتێ ئەم باوەڕە لەخۆ خۆشەویستربوو، ئەوسا لەسەر ئەم بنچینە پاکە، خۆشەویستی و پشتیوانی پتەو بۆ هەڵگرانی ئەم

بـاوەڕەو ڕێبـوارانی ئـەم ڕێیـە دروسـت دەبـێ، بەپێچـەوانەش ڕق و دوژمنایەتی بۆ دوژمنانی ئەم ڕووناکیە زیاتر دەبێ،

هـەروەکو شێخ **عبداللطیف** کوڕی عبدالرحمن کوڕی حسن آل الشیخ دەفەرمووێ :ـ

(( **أصل الموالاة الحب، وأصل المعاداة البغض، وينشأ عنهما من أعمال القلوب والجوارح مايدخل في حقيقة الموالاة والمعاداة كالنصرة والأنس والمعاونة، وكالجهاد والهجرة، ونحو ذلك من الأعمال**)) [1]

واتە : بنچینەی دۆستایەتی خۆشویستنە، وە بنچینەی دوژمنایەتیش ڕق و بوغزاندنـە، وە لێیانـەوە چـەندین کـاری دەروونـی و ئەنـدامی دروست دەبێ کەدەچێتە نێو واتای ڕاستەقینەی دۆستایەتی کردن و دوژمنایەتی کردن وەک سەرخستن و هاودەمی و یارمەتیدان، هـەروەها وەک جیهادکردن و کۆچ کردن و شێوەی تر لەم کردەوانە .

کەواتـە خۆشەویسـتی و پشـتیوانی لـەپێناو خـودا بـۆ هـاوبیروڕاو هاوڕێگاو هاوکردارە، هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ} المائده: ٥٥

واتـە : بەڕاسـتی خۆشەویسـتی و یارمـەتی دەری ئێـوە تـەنها خـوداو پێغەمبەرەکـەی و بـاوەڕدارانن، ئەوانـەی نوێـژەکان ئـەنجام دەدەن و زەکات دەدەن و بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خـوا .هـەروەها خـوای بێ هاوتا دەفەرمووێ :ـ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} المائده: ٥٤

---

(١) الدرر السنية (١٥٧/٢) ..

واتــە : ئــەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە هەرکەســێ لــەئێوە هەڵگەڕێتـەوە لـە ئایینەکـەی ئـەوا خـودا لـەجیاتی ئـەوان گـەل و کۆمەڵێکی تر ئـەهێنێ خـوا ئـەوانی خـۆش دەوێ و ئـەوانیش خوایـان خۆش دەوێ، بەسۆزو بەزەیین بەرامبەرباوەڕداران،

بەهێزو تونـدن بەرامبـەر بـێ بـاوەڕان جیهـاد دەکـەن لـەڕێی خـواداو لەسـەر زەنشـت و لۆمـەی سەرزەنشـت کـاران ناترسـن، ئەمـەش چـاکەو بەهرەی خوایە ئەیبەخشێ بـە هەرکـەس کـەخۆی بیـەوێ، خـوداش دەسەڵات فراوانی زانایە .

ابـن **کـثیر**(ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ) لـە ڕاڤـەی ئـەم ئایەتـەدا دەفەرمووێ :- ((**هذه صفات المؤمنين الكمل أن يكون أحدهم متواضعاً لأخيه ووليه، متعززاً على خصمه وعدوه، كما قال تعالى** ((**مَحَمدٌ رَسُولُ الله وَالَذين مَعَهُ أَشِداءُ عَلَى الكُفارِ رُحَماءُ بَينَهُم**)) **وفي صفة رسول الله** (ﷺ)**أنه الضحوك القتال، فهو ضحوك لأوليائه قتال لأعدائه**))[1].

واتە : ئەمە سیفاتی باوەڕدارە تەواوەکانە، کـە دەبـێ خـۆ بەکـەم گـر بـێ بەرامبـەر براکـەی و دۆسـتەکەی، سـەربەرزو شـکۆمەندبێ لەسـەر ڕکابەرو دوژمنـەکەی هەروەکـو خـوای گـەورە فەرموویـەتی : (محمد (ﷺ)نێردراوی خوایە، ئەوانەش کـە لەگـەڵیـدان توندوتیـژن لەسـەر کـافران، نـەرم و بەبـەزەیین لـەنێوان یەکتریـدا) وە لـەبارەی سـیفەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـاتووە کـە ڕووخۆشـی جـەنگاوەر بووە، ڕووخۆش و دەم بەزەردەخەنـە بـووە بـۆ دۆسـت و شـوێنکەوتوانی، جەنگاوەرو بەدەست بووە بۆ دوژمنـەکانی .

ئینجـا هـەروەکو بـۆ هێنانـەدی دۆسـتایەتی (**المـوالاة**)لـەخۆمان ئەوپـەڕی خۆشەویستی بۆ خواو پێغەمبەر (ﷺ)دەربـبـڕین و لەمەیدانی ئاکاروکردەوەشـدا ئەوپـەڕی مـل کـەچـی و شـوێنکەوتووییمان بـۆ بنـوێنین و سـەربازو بـەرگریکاری پـەیام و بەرنامەکـەیان بـین، بـۆ

(١) تفسير ابن كثير (٦٥/٢).

هێنانەدی دوژمنایەتیش (**المعاداة**) بەهەمان شێوە ئەوپەڕی بوغزو ڕقی دڵمان بەسەر دوژمنانی خواو پێغەمبەرو پەیامەکەیان هەڵبڕێژین، بێ گومان سەرسەخت ترین کۆمەڵیش لەدوژمنایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان کۆمەڵی جولەکە و موشریکەکانن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

{ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا } المائدە: ٨٢

واتە : دەبینی کە لەهەموو خەڵکی توندتر لەدوژمنایەتی کردنی باوەڕداران جولەکەو موشریکەکانن .

دیارە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە جولەکە کوفرو گومڕاییان گەیشتە ڕاددەیەک کە قسەی ناشیرین و سیفەتی نەشیاویان دەدا پاڵ خودی خوای گەورەش، مەگەر هەر ئەوان نین کە دەڵێن : {إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ} آل عمران: ١٨١

واتە : خودا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین (تعالى اللّه).

هەروەها دەڵێن :{ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ} المائدە: ٦٤

واتە : دەستی خوا قنجاوە و نابەخشێ .

تا کوڕیشیان بۆ خوا بڕیارداو ووتیان {عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ} التوبە: ٣٠

واتە : عوزەیر کوڕی خوایە. (تعالى اللّه عما يقولون علواً كبيرا).

ئینجا دوژمنایەتیان بۆ پێغەمبەرانی خوا (سەلامی خوایان لێ بێ) لەوەشدا چەندین پێغەمبەریان شەهید کردووە و چەندین جاریش هەوڵی شەهید کردنی پێغەمبەری ئێمەیان داوە (ﷺ)هەر لەژەهراوی کردنی خواردنی، ئینجا سیحرو جادوکردن لەپێغەمبەر (ﷺ)، پاشان هاوپەیمانی و یارمەتی دانی موشریکەکان لە جەنگیان دژی پێغەمبەر (ﷺ). لەدوای ئەوان نەصرانیەکان کە ئەوانیش دەڵێن عیسا کوڕی خوایە (تعالى اللّه) پاشان دوژمنایەتی دوورو درێژیان بۆ پەیامی ئیسلام و موسڵمانان و شەهیدکردنی ملیۆنەها موسڵمان بەدرێژایی مێژوو تا ئەمڕۆش لەگەڵدابێ، هەربۆیە خوای گەورە باوەڕداران ئاگاداردەکاتەوە لەوەی خۆشیانبوێن، یان دۆستایەتیان بکەن، یان یارمەتی و پشتیوانیان بکەن، هەروەکو دەفەرمووێ -

{يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} المائده: ٥١

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو نەصرانیەکان مەکەن بەدۆست و خۆشەویستتان و پشتیوانیان مەکەن، چونکە ئەوان دۆست و پشتیوانی یەکترن (لەدوژمنایەتی کردنی ئێوە) هەرکەسێکیش لەئێوە ئەوانی خۆش بوێ و پشتیوانیان بکات ئەوا ئەویش لەوانە، بەڕاستی خودای گەورە ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات.

هەربۆیە عبداللە کوڕی عُتبە (ڕەزای خوای لێ بێ)دەیفەرموو :ـ

(**ليتقِ أحدكم أن يكون يهودياً أو نصرانياً وهو لايشعر**) [١]

واتە : با هەر یەکێک لەئێوە ئاگای لەخۆی بێ و خۆی بپارێزێ لەوەی ببێتە جولەکە یان نەصرانی بەبێ ئەوەی هەست بکات .

هەروا پێویستە ڕق و دوژمنایەتیش بەرامبەر کافرو موشریکەکان نیشان بدرێ، چ ئەو موشریکانەی دوێنێ وەک جولەکەو نەصرانیەکان، مندالیان دەدا پاڵ خودای گەورەو دەیانووت: مەلائیکەتەکان کچی خوان (تعالى الله عن ژلک)هەروەکو خودا لەبارەی ئەم کوفرەیان دەفەرمووێ :ـ

{وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ ۙ وَلَهُمْ مَا يَشْتَهُونَ} النحل: ٥٧

واتە : کچیان بۆخودا بڕیاردەدا پاکی و بەرزی بۆخوا کەچی بۆ خۆشیان ئەوەی پێیان خۆش بوو (کوڕ) بۆخۆیان دادەنا .

هەروەها چ ئەو موشریکانەی ئەمڕۆش کە دەڵێن : خودا ستەمی لە ئافرەت کردووە کاتێک لەمیراتدا یەک بەشی بۆداناوە بەرامبەر دووبەشی کوڕ، وە کاتێک دووئافرەتی بەیەک شاهێد داناوە، بۆیە دەڵێن پێویستە یاسای تر بهێنینە جێگای یاساکانی خوا (**تعالى الله عما يقولُ الظالمون عُلُوا كبيراً**) .

---

(١) تفسير ابن كثير (٦٣/٢).

هەربۆیە خوای گەورە هەموو ئەمانە (جولەکەو نەصرانی و موشریکەکان) کۆدەکاتەوەو باوەڕداران قەدەغە دەکات لەوەی کەمترین شت لەخۆشەویستی و پشتیوانیان هەبێ بۆیان، هەروەکو دەفەرمووێ: ـ

{يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ} المائدە: ٥٧

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەوکەسانە مەکەن بەخۆشەویستی و پشتیوانی لێکراوی خۆتان لەوانەی ئایینی ئێوەیان بەگاڵتەو گەمە دادەنێن لەوانەی پەرتووکیان پێ بەخشرایە پێش ئێوەو کافرەکانیش، لەخوا بترسن و مەیانکەن بە نزیک و خۆشەویست ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

ئینجا محمد کوڕی سعید کوڕی سالم **القحطاني** لەم بارەیەوە پوختەیەک کۆدەکاتەوە کە دەفەرمووێ: ـ (**ولما عقد الله الأخوة والمحبة والموالاة والنصرة بين المؤمنين، ونهى عن موالاة الكافرين كلهم من يهود ونصارى وملحدين ومشركين وغيرهم، كان من الاصول المتفق عليها بين المسلمين: أن كل مؤمن موحد تارك لجميع المكفرات الشرعية تجب محبته وموالاته ونصرته، وكل من كان بخلاف ذلك وجب التقرب الى الله ببغضه ومعاداته وجهاده باللسان واليد بحسب القدرة والإمكان.**) [١]

واتە: کە خوای گەورە برایەتی و خۆشەویستی و پشتیوانی و سەرخستنی یەکتری دامەزراندووە لەنێوان باوەڕداران و ڕێگری کردووە لە خۆشویستن و دۆستایەتی و پشتیوانی کردنی کافرەکان هەموویان لەجولەکەو نەصرانیەکان و خوانەناس و بێ دینەکان و موشریکەکان و ئەوانی تریش؛ کەواتە لەو بنچینانەی کە

(١) الولاء والبراء في الاسلام / ٩١.

کۆدەنگی لەسەرە لەنێو موسڵمانان ئەوەیە کە هەموو باوەڕدارێکی خودا بەتەنها گرو دوور لەهەموو گوفتارو کردارە کوفرینەکان ئەوا خۆشویستنی و پشتیوانی کردنی و سەرخستنی واجب و پێویستە، وە هەرکەسێکیش بەپێچەوانەی ئەوەبوو ئەوا واجب و پێویستە خۆمان لەخوا نزیک بکەینەوە بە بوغزاندنی و دوژمنایەتی کردنی و جیهاد کردن لەدژی بەزوبان و دەست بەگوێرەی تواناو گونجان .

ئەگەر وامان کرد ئەوا دەستمان گرتووە بە پتەوترین پەت و گرێ ی باوەڕ، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

(**أوثق العُرى الإيمان : الموالاة في الله والمعاداة في الله، والحُبُ في الله، والبغض في الله**) [1]

واتە : توندترین و پتەوترین گرێ و قولفەی باوەڕ بریتییە لەدۆستایەتی کردنی باوەڕداران لەبەر خواو دوژمنایەتی کردنی بێ باوەڕان لەبەر خوا ، وەیاخود لەریوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرمووێ :ـ(**أفضل الأعمال الحُبُ في الله والبغض في الله**) [2]

هەروەها دەفەرمووێ : ـ (**ثلاث من كُن فيه وجد حلاوة الإيمان، من كان الله ورسوله أحبَ إليه مما سواهما، وكان أحبَ عبداً لايحبه إلّالله، ومن يكره أن يعود في الكفر، بعد إذ أنقذه الله، كما يكره أن يلقى في النار.**) [3]

واتە : ((سێ شت هەن هەرکەسێ تێیدا هەبن ئەوا هەست بەشیرینی باوەڕ دەکات، کەسێ خواو پێغەمبەر(ﷺ) لەهەموو کەسێکی تری خۆشتربووێت، ئەگەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، هەروەها پێشی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێ باوەڕی، دوای ئەوەی خوا ڕزگاری کرد لێ ی ، هەروەک چۆن پێی

(١) صححه الالبانی في سلسلته برقم ٩٩٨.

(٢) رواه ابوداود في سننه برقم ٤٥٩٩.

(٣) متفق علیه.

ناخۆشـە فـڕێ بدرێتـە نـاو ئـاگر،)) چـونکە بەڕاسـتی سـەرەنجامی کوفر ئاگرە.

سەرنجی ئەم نموونەیەش بدە لەچۆنیەتی جێ بەجێ کردنی ئەم دۆستایەتی و دوژمنایەتیـە لەلایـەن ئەصحابەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)، (( أبـو موسـا الاشـعری (ڕەزای خـوای لـێ بێ)دەفـەرمووێ : بـە عومـەری کوڕی خەتتابم (ڕەزای خوای لێ بێ)ووت : من نووسەرێکی نەصرانیم هەیە.

فەرمووی : ئەوەچیتە خوا بتکوژێ، مەگەر نەتبیستووە کەخوا دەفەرمووێ : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ }

ئایا بۆ باوەڕدارێکت نەدەکرد بە نووسەر (کاتب) ؟

ووتـی : ئـەی گـەورەی بـاوەڕداران نووسـینەکەی بـۆ منـەو ئایینەکەشی بۆ خۆیەتی .

ئیمامی عمر فەرمووی : ناکرێ من ڕێزیان بگـرم لەوکاتـەی خـودا سووکی کـردوون، هـەروەها کـارو توانایـەکیان ناخەمـە ژێـر دەست لەوکاتـەی خـودا ڕیسـوای کـردوون، لەخۆشـم نزیکیـان ناکەمـەوە کاتێ خودای گەورە دووری خستوونەتەوە.)) [1]

بـەڵام زۆرێکیش لەموسڵمانانی ئـەمڕۆ یـان بەنـەزانی خـوا پـەرستی دەکات، یاخود زانایە کەچی لەهەڵسوکەوتی خۆیـدا ئـەم بنچینە پتەوەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی جێ بەجێ ناکات و خراپـی دەکات بەبیانووی ئەوەی ئایینی ئیسلام ئـایینی خۆشەویستیە، یـاخود لـەژێر ناوی (تقارب الادیـان) بۆیـە دەبـێ ئاگـاداری ئـەم جـۆرە کەسانەبین، هەروەکو ابن تیمیە (ڕەحمەتی خـوای لـێ بـێ) دەفەرمووێـ (**احـذرو فتنة العالم الفاجر، والعابد الجاهل، فإن فتنتهما فتنـة لكـل مفتون لأن الأول يشبه المغضوب عليهم الذين يعلمون الحق ولا يتبعونه، والثاني يشبه الضالين الذين يعملون بغير علم**) [2]

---

(١) اقتضاء الصراط المستقيم/٥٠ والحديث رواه احمد واورده البيهقي في السنن الكبرى (١٣٧/١٠)..

(٢) أقتضاء الصراط المستقيم /٢٥.

واتە : ئاگاداری بەڵای زانای خراپەکارو خواپەرستی نەزان بن، چونکە بەڵاکەیان فتنەیە بۆ هەموو کەسێکی بەڵادار، جا یەکەمیان بەوکەسانە دەچێ کەخوا خەشمی لێ گرتوون(جولەکە) کاتێک دەیانزانی هەق چۆنە کەچی شوێنکەوتووی نەدەبوون، دووەمیشیان بەوکەسانە دەچێ کە گومڕابوون(نەصرانیەکان) کاتێ بەبێ زانیاری خواپەرستیان دەکرد .

بەڵام ئایا ئەگەر لەخودی موسڵمانێکدا چاکەوخراپە هەبوو، چۆن دۆستایەتی و پشتیوانی لێ دەکرێ ؟

ابن تیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

((ئەگەر لەکەسێکدا چاکەو خراپە، تاوان و گوێڕایەڵی کۆبۆوە، هەروا سەرپێچی و سوننەت و بیدعەی تێدا کۆبۆوە، ئەوا بە ئەندازەی ئەو خێروچاکەیەی تێیدایە دۆستایەتی و پشتیوانی و پاداشتی دەکرێ، هەروەها بەئەندازەی ئەو خراپەو تاوانەی هەیەتی دوژمنایەتی و سزای پێ دەدرێ، کەواتە لەکەسێکدا هەردووباری ڕێزلێنان و شەرمە زارکردن کۆدەبێتەوە، نموونەش ئەگەر کەسێ دزی کرد دەستی دەبڕدرێ لەسەر دزیەکەی، هەروەها لەخانەی دارایی (بیت المال) بە ئەندازەی پێویستی یەکەی پارەی پێ دەدرێ، ئەمە ئەو بنچینەیە کە ئەهلی سوونەو جەماعە لەسەری کۆکن، وە خەواریج و موعتەزیلەکان و ئەوانەش کە لەگەڵ ڕای ئەوانن پێچەوانەی ئەو بنچینەیەن))[1] .

---

(١) مجموع الفتاوي (٢٨/٢٠٨-٢٠٩).

# بەشی پێنجەم

## مانای بەشی دووەمی شایەتمان (محمد رسول اللّه)

## پێویستیەکانی ئەم بەشەی شایەتمان

- باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ)
- بەڕاستی زانینی هەموو فەرموودەو هەواڵەکانی
- گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی
- خۆ دوورخستنەوە لەوشتانەی قەدەغەی کردووە
- خۆشویستنی بەبێ زیادە ڕۆیی

## مانای بەشی دووەمی شایەتمان (**محمد رسول الله**)

لەدوا ڕۆژدا هیچ گەل و نەتەوەیەک ناجولێ و هەنگاو نانێن تاوەکو دووپرسیاریان لێ نەکرێت ؛ کە ئەمانەن :ـ

١ -**ماذا کنتم تعبدون** ؟ ئایا ئێوە چیتان دەپەرست ؟

٢ -**وبماذا أجبتُم المرسلين** ؟ ئایا چۆن وەڵامی پێغەمبەرانتان دایەوە ؟

لەباسی (( **لا إله إلا الله** ))ئەوەمان خستەڕوو کە بریتیە لەشایەتی دان بەگوفتارو سەلماندنی بەکردار کەوا هیچ پەرستراوێک نیە بەهەق شایستەی پەرستن بێت جگە لەخودای تاک و تەنها. ئینجا لەم بەشەی شایەتمانیش دەبێ بڕیاربدەین بەگوفتارو بیسەلمێنین بەکردار کە هیچ کەسێکیش شایستەی شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی کردنی ڕەهای نیە جگە لە مُحَمّد (ﷺ) ئەمەش تەنها بە ووتنی (محمد رسول الله) نیە بەزوبان، یاخود تەنها بەهۆنراوەو سروودوپێدا هەڵگوتن و هەڵواسینی دروشم، کە ئەمەش لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاواییەکانە، بەڵکو دەبێ بزانین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆ ئەوە ڕەوانەکراوە کە بەرنامەی خودا لەسەر زەوی پەیڕەو بکات و دینی خودا وەکو کاڵایەک بەبەر باڵای خەڵکدا بکات ئەوەش بەگوێڕایەڵی کردنی تەواوی پێغەمبەر (ﷺ)جێ بەجێ دەبێ.

کەواتە پوختەی مانای شایەتمان واتە :ـ

**لامعبود بحق إلَا اللهُ الأحد.**

هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە تەنها خودای تەنها (سبحانه وتعالى)

**لامتبوع بحق إلَا الرسول أحمد.**

هیچ کەسێکیش بەهەق شیاوی شوێن کەوتن نیە تەنها پێغەمبەر أحمد (ﷺ)ئینجا شوێن کەوتنی ڕاستەقینەی پێغەمبەری خواش (ﷺ)خۆی بەرجەستە دەکات لەم خاڵانەی خوارەوە :ـ

یەکەم :ـ باوەڕهێنان بەپێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) .

دووەم :ـ بەڕاست زانینی هەموو فەرموودەو هەواڵەکانی .

سێ یەم :ـ گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی .

چوارەم :ـ خۆ دوورخستنەوە لەوشتانەی قەدەغەو سەرکۆنەی کردووە.

پێنجەم :ـ خۆشویستنی بەبێ زیادەڕۆیی .

**یەکەم :- باوەڕهێنان بەپێغەمبەرایەتی مُحَمّد (ﷺ) .**

باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)مەرجە بۆ موسڵمان بوون وەباوەڕی هیچ کەسێک تەواو نابێت تاوەکو باوەڕ بەپێغەمبەرایەتی محمد نەهێنێت، کە بەم بەڵگانە سەلمێنراوە کە نێردراوی خوایە

١ – بەڵگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز :

{یس ، وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ ، إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ } یس: ١ - ٣

واتە / هەردوو پیتی (یا ، سین) و پیتەکانی تریش کەلەسەرەتای چەند سورەتێک هاتووە ڕاڤەکارانی قورئان چەندین مانایان لەسەری فەرمووە بەڵام زۆرێکیش ووتوویانە کە هەرخوا دەزانێ مانای چی یە.

پاشان خوای گەورە سوێند بەقورئان دەخوات کە دەفەرمووێ : والقرءان الحکیم : سوێند بەقورئانی پڕ لەدانایی ﷺ بەڕاستی ئەی محمد (ﷺ)تۆ لە پەیامبەرانی خوای. هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :ـ

{وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا } النساء: ٧٩

واتە/ ئێمە تۆمان ناردووە بەپەیامبەر بۆخەڵکی، خوا بەسە شایەتی بۆ ئەوە بدات .

هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :ـ

{مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ } الفتح: ٢٩

واتە/ محمد نێردراوی خوایە (ﷺ)ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندوتیژن، لەنێوان خۆیاندا بەبەزەیین .

هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :ـ

**{مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَـٰكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ}** الأحزاب: ٤٠

واتە/ محمد باوکی هیچ لەپیاوەکانتان نیە، بەڵکو ئەو نێردراوی خواو کۆتا هەمینی پێغەمبەرانە .

هەروەها لەچەندین ئایەتی تریش .

٢- بەڵگەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) :ـ

**(إنَهُ سيكون من أمتي كذابون ثلاثون، كُلُهُم يزعُمُ أنَهُ نَبيٌّ، وأنا خاتَمُ النَبيينَ لانَبِيَ بَعدي)** [١].

واتە/ بەڕاستی لەدوای من لەناو ئوممەتەکەم (٣٠) کەسی درۆزن پەیدا دەبن، هەریەکەیان بانگەشە دەکات کە پێغەمبەرە، بەڵام من کۆتاهەمینی پێغەمبەرانم، هیچ پێغەمبەرێک لەدوای من نیە.

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی :ـ

**(فُضِلتُ عَلَى الانبياء بِستٍ، أعطيتُ جوامِعَ الكَلِم، ونُصِرتُ بِالرُعبِ، وأحِلَت لِيَ الغنائِم، وجُعِلَت لِيَ الأرضُ طَهُوراً ومُسجِداً، وأرسِلتُ إلى الخَلقِ كافَةً، وَخُتِمَ بيَ النبيون)** [٢]

واتە/ پایەبەرزتر کراوم بەسەر پێغەمبەران بەشەش شت: کۆکەرەوەی ووتەم پێ بەخشراوە (واتە : بەچەند ووشەیەکی کەم ماناو مەبەستێکی زۆری دەگەیاندە دڵ و گوێ ی خەڵکی) و بەسەر دوژمنەکانم سەرکەوتووم بەهۆی ئەوەی لەدوورەوە لێم دەترسان، کەل و پەلە دەسکەوتووەکانی جەنگم بۆ حەڵال کراوە، وە خاکیش بۆم پاک و وەک جێگا نوێژ دانراوە، وە بۆ

---

(١) رواه ابو داود والاصل عند مسلم(٢٨٨٩) ورواه احمد في المسند وابونعيم في الحلية وسنده صحيح.

(٢) رواه مسلم وأخرجه الترمذي واحمد والبغوي..

هەموو دروستکراوەکان بەپێغەمبەر ڕەوانەکراوە، وە بەمن کۆتایی بەپێغەمبەران هاتووە.

دەبێ موسڵمان دوای باوەڕ هەبوون بەخودا شانازی بەوەبکات کە یەکێکە لەئوممەتی ئەم پێغەمبەرە پایەبەرزە (ﷺ).

٣ – شایەتی تەورات و ئینجیل :ـ

لەو بەڵگانەش کە باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)پێویست و واجب دەکات شایەتی و مژدەو باسی تەوڕات و ئینجیلە بە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ} الأعراف: ١٥٧

واتە/ ئەوانەی کە شوێن ئەو پێغەمبەرو نێردراوە نەخوێندەوارە دەکەون (کە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەوکەسەی کە نامەدارەکان (واتە جولەکەو گاورەکان) دەیبینن بەنوسراوی لەلایان باسی کراوە لەتەوڕات و ئینجیل دا کە فەرمانیان پێ دەکات بەچاکەو ڕێگرییان لێ دەکات لەخراپە، شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵال دەکات و شتە پیسەکانیان لێ حەڕام (قەدەغە) دەکات .

جا باوەڕنەهێنانی ئەم جولەکەو گاورانە بەپێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)سەیرە !

بەڵام لەمەش سەیرتر ئەوەبوو کە موشریکەکانی عەرەب باوەڕیان پێی نەبوو چونکە دەیانووت چۆن دەبێ پێغەمبەر مرۆڤ بێ ! کەچی لایان ئاسایی بوو کە خواکانیان لەبەرد بێ !!!

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :ـ

{وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ} الصف: ٦

واتە/ کاتێک کە عیسای کوڕی مەریەم ووتی : ئەی نەوەی یعقوب بێگومان من نێردراوی خوام بۆلای ئێوە، بەڕاست دانەری

ئەوەی پێش خۆمم لەتەوڕات، وەمژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێک کە لەدوای من دێ ناوی ئەحمەدە .

بەڵام زاناو شارەزاکانی ئاینی جولەکەو گاورەکان بەمەبەستی چۆڵ نەبوونی دەوروبەریان و بەردەوام بوونیان لەخواردنی پارەو ماڵاتی خەڵکی دەستکاریەکی زۆری هەموو نوسخەکانی تەوڕات و ئینجیلیان کردو ئەو شوێنانەیان سڕییەوە و گۆڕییان کە بەراشکاوی ناوی پێغەمبەر محمدی تێدا هاتووە، تەنها لەتەوڕاتی سامرە و ئینجیلی برنابا ناووباسی ماوە کە لەپێش ئیسلامدا هەبوون بەڵام کەنیسە قەدەغەی کرد لە بڵاوبوونەوەی ئەم دوو نوسخەیە لەناو خەڵکی لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی میلادی تاوەکو لەم دواییەدا لەناوچەی دەریای مردوو چەند دەست نووسەکی لێ دۆزرایەوە کە تەواو دروست و هاوشێوەی ئەوەی هاتووە لە تەوڕاتی سامرە و ئینجیلی برنابایە.

هەروەکو لە ئیصحاحی چل و یەکەم لەدەقی ووتەی (٢٩) هاتووە کە : (**فاحتجب اللهُ وَطَرَدَهُما الملاكُ ميخائيل من الفردوس** (٣٠) **فلما التفت آدم رای مكتوباً فوق البابِ : لا اله إلا الله محمد رسول الله**) .

واتە/ خودا لێیان کەوتە دوای پەردە و فریشتەیەک بەناوی میخائیل، ئادەم و حەوای دەرکرد لەبەهەشتی فیردەوس (٣٠) کاتێک ئادەم ئاوڕی دایەوە بینی لەسەر دەرگاکەی بەهەشت نوسراوە : لا اله إلا الله محمد رسول الله.[1].

ئینجا ئەگەر باس لە بەڵگە عەقڵیەکانیش بکەین ئەوا بەڵگەی عەقلی لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) زۆر زۆرن کە لەهەموویان گەورەترو دیارتر ئەو موعجیزەو بەڵگە زەقانەیە کە خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی بەخەڵکی نیشانداوە.

(١) انجيل برنابا / ٦٣.

گومانی تێدانیە کە گەورەترین موعجیزەش کە تارۆژی دوایی دەمێنێت و هیچ کەسێک و هیچ کۆمەڵێک و هیچ وولاتێک و هیچ هێزێک تائێستا نەیتوانیوە یەک سورەتی سێ ئایەتی لەوێنەو هاوشێوەی قورئان بهێنن و دابڕێژن، وە ناشتوانن .

پرسیار : ئایا قورئانێک پێش هەزارو چوارسەدوچل ساڵ هاتبێ، بەڵام تائێستا و لەسەردەمی پێشکەوتنی خوێندن و تەکنەلۆجیاو ئاسمان ناسی کەس نەیتوانیوە لەشێوەی یەک سورەتی قورئان بهێنێ ، ئایا بەڵگە نیە کە ئەمە موعجیزەیەو لەلایەن خواوە هاتووە ؟ وەڵامەکەش دیارە .

ئەمە سەرەڕای موعجیزەکانی تر وەکو کەرت کردنی مانگ بەپەنجەی پیرۆزی، هەروەها هاتنی ئاو لەنێوان پەنجەکانی، هەروەها گریانی قەدە دارخورمایەکەی ناو مزگەوت بۆ دوورکەوتنەوەی پێغەمبەر لێ ی ، هەروەها شەورۆکردنی بۆ بیت المقدس و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان، هەروەها سەلام کردنی بەرد لەپێغەمبەر، هەروەها زۆربوونی خواردن و شیر کاتێک دوعای لەسەر خوێند ، هەروەها چەندین ئاژەڵ کەبۆ پێغەمبەر (ﷺ)کڕنۆشیان بردووە.

هەروەها لەفەرموودەی **كعب الأحبار** (ڕەزای خوای لێ بێ) دا وەسفی پێغەمبەر (ﷺ)تەنانەت ئوممەتەکەشی هاتووە کە دەفەرمووێ : ــ

(**إني أجدُ في التوراة مكتوباً : مُحَمدٌ رسول الله ، لافظٌ ولاغَليظ، ولاسَخابٌ في الأسواق، ولايَجزي السَيئة بالسيئة، ولكن يَعفو وَيَصفَح، أمَتُهُ الحمَادوُن، يَحمَدوُنَ الله في كُل مَنزِلَة، ويُكَبِرونَهُ عَلى كُلِ نَجد، يأتَزِروُنَ إلى أنصافُهُم، وَيوضِئُون أطرافهم، صَفُهُم في الصلاة، وصَفُهم في القِتالِ سَواء، مُناديهم ينادي في جَوِ السَماء، لَهُم في جَوفِ اللَيلِ دَويٌ كَدوي النَحلِ ، مَولِدُهُ بمكة ، مَهجَرُهُ بِطابة، وَمُلكُه بِالشام**)[1].

---

(١) صحيح السيرة النبوية ٣٠.

واتــە :ــ مـن دەبینـم کــە لەتەوراتــدا نوســراوە، مُحمـد نێـردراوی خودایــە، نــە لەهــەڵس و کەوتـدا توندوتیـژەو نـەتوورەو قسـە رەقــە، هەرگیز بەخراپە وەڵامی ئەوکەسانە ناداتەوە کە هەڵەو خراپـەی بەرامبــەر دەکــەن، بــەڵکو لێیــان دەبــووریٚ و چاوپۆشــی لــیٚ دەکــا، ئوممەتەکــەی گــەلێکی ســتایش کــارن، ستایشــی خــوا دەکــەن لەهــەموو بارودۆخێــک، وە خــودا بــەرزدەگرن (اللّه اکبــر) دەڵــێن لەهەموو بەرزی یەک، جلیان کورت دەکەن تا نیوەی قاچیان،

وە دەســت و پــیٚ کانیــان دەشــۆن (واتــە دەســت نوێــژ دەشــۆن) ڕیزیــان لەنوێـژداو ڕیزیـان لەجـەنگ و جیهاددا وەک یەکـە، بـانگ بیـژیان بەبۆشــایی ئاســمان بــانگ دەکــات (واتــە بــۆ نوێــژ)، لەنوێــژو خواپەرسـتنیان لـەتاریکی شـەودا دەنگێکیـان هەیـە لەشـێوەی دەنگی شانەی هـەنگ، شوێنی لـەدایک بوونی شاری مەککەیە، ئەوشــارەش کــە کۆچــی بــۆ دەکــات گابەیــە (واتــە مەدینــە)، دەسەڵاتیشی دەگاتە هەموو شام .

ئینجا لـەدوای ئـەم هەواڵـە بەسیفات و ئاکاری پێغەمبـەری کۆتـا (ﷺ)وە شارەزایی جولەکەو نەصرانیەکان بەڕاستی ئـەم نێـردراوە، پاشــان بــاوەڕ نــەهێنانیان بەپێغەمبەرایەتیەکــەی و پەیامــە خواییەکــەی، دەرئەکــەویٚ کــەهیچ پاســاوێک نــەبووە و نیــە لەباوەڕنەهێنانیان ئەوەنەبیٚ کە تەنها لەبەر ڕق و ئیرەیی بردنی دڵە تاریک و ڕەشەکانیانە بەم ڕووناکیە بۆیە سەرکەش و لاساربوون، هەروەکو خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمووێ :

{وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ} **البقرة**: ١٠٩

هەروەها دەفەرمووێ :ـ

{مَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْكُمْ مِنْ خَيْرٍ مِنْ رَبِّكُمْ } **البقرة**: ١٠٥

هەربۆیەش شایستەی ئەو بڕیارو سەرەنجامە بوون کە پێغەمبەری جیهان (ﷺ) بەسەریدان کە دەفەرمووێ :ـ

**(والذي نفسُ محمد بيدهِ لايَسمَعُ بي أحدٌ من هذه الأمةِ يَهوديُ ولانصراني ثُمَ يَموتُ ولم يؤمن بالذي أرسلتُ به، إلَا كان مِن أصحابِ النار)** [١]

واتە: ـ سوێند بەوکەسەی گیانی محمد بەدەستی ئەوە هەرکەسێک لەم ئوممەتە چ جولەکەبێ یان نصرانی هەواڵی من ببیستێ، پاشان بمرێ و باوەڕ نەهێنێ بەوەی پێی ڕەوانەکراوم، ئیلا دەبێتە یەکێک لە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ.

سزایەکی پڕ بە پێست بەرامبەر ئەو سەرکەشی و دڵ ڕەقیەی بۆتە خوو نەریتێکی لەناوبەریان {جَـزَاءً وِفَاقًا} النبأ:٢٦

{وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ} فصلت: ٤٦

هەروەها لەو شتانە کە پێویستە لەئایینی ئیسلامدا بزانرێ، وە بەرامبەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)بڕیار بدرێ ئەوەیە کە محمدی کوڕی عبدالله(ﷺ)کۆتا پەیامبەری خودایە بۆ سەرزەوی، هیچ پێغەمبەرێک لەگەڵ ئەودا نەهاتووەو هیچ پێغەمبەرێکیش لەدوای ئەو نیەو نایەت، هەروەکو عبدالقاهر البغدادی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)فەرموویەتی : ـ موسڵمانان و خاوەن پەرتووکە ئاسمانیەکان کۆ ڕان لەسەر ئەوەی یەکەم پەیامبەر کە ڕەوانەکرابێ لەنێو خەڵکدا، ئادەمە (سەلامی خوای لێ بێ)،کۆتا پەیامبەریش لەلای موسڵمانان محمدە (ﷺ).[٢]

هەروەها ابن حزم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ : ـ موسڵمانان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی هیچ پێغەمبەرێک لەگەڵ محمد(ﷺ)نەهاتووە و هیچ پێغەمبەرێکیش لەدوای نیە[٣] .

ئەمەش ناڕەوایی و گومڕایی ڕای ئەوکەسانە دەردەخات کە پێیان وایە زەردەشت پێغەمبەر بووەو لەسەردەمی پێغەمبەری خۆشەویستمان

---

(١) اخرجه مسلم كتاب الإيمان (١٣٤/١).

(٢) اصول الدين : ١٥٩.

(٣) مراتب الاجماع : ١٧٣..

(ﷺ)یان لەدوای ئەو بۆچەند نەتەوەیەک ڕەوانەکراوە، هەروەکو ((ابن القیم (رحمه الله)لەباسی مەجوسەکاندا دەفەرمووێ :ـ تاقمیان هەیە دان بە پێغەمبەرایەتی زەردەشت دەنێن وەکو مەزدەکیەو خەرمیەو هی تر)) [1].

هەروەها گومڕایی (**رافضیه کان**) یش دیارە کەپێیان وایە ئیمامی عەلی کوڕی أبی تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ)پێغەمبەر بووە و جبرائیل (سەلامی خوای لێ بێ)هەڵەی کردووە یان هەندێکیان پێیان وایە ناپاکی کردووە لەهێنانی پەیامی خودا .

ئەم ووتانە گومانی تێدانیە کە بێ بنەمان و کوفری ئاشکران، هەروەکو ابن تیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :ـ

ئەوکەسەی جنێودان بەهاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) ببەستێتەوە بەبانگەشەی ئەوەی عەلی خودایە، یان پێغەمبەر بووە و جبرائیل (سەلامی خوای لێ بێ)هەڵەی کردووە لەهێنانی پەیامەکە، ئەمە گومان لەوەدانیە کە بێ باوەڕە، بەڵکو گومان نیە لەبێ باوەڕی ئەوکەسەش کەبڕیاری بێ باوەڕییان بەسەردا نادات [2] .

دووەم :ـ بەڕاست زانینی هەموو فەرموودەو هەواڵەکانی .

پێویستە باوەڕمان وابێ کە هەرپیتێک یان هەر ووشەیەک لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)هاتۆتە دەرێ ڕاست و دروستە هەروەها هەواڵی ڕوودانی هەرشتێکی دابێ ئەوا ڕاستەو ڕوودەدات لەئێستادابێ یاخود لەداهاتوو، چونکە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)لەخۆیەوە هیچ قسەیەکی نەکردووە بەڵکو هەموو وەحی و پەیامی خودا بووەو بەتەواوی ڕای گەیاندووە هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی :ـ

{**وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى ، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى**}النجم: ٣ – ٤

واتە/ لەخۆیەوەو لە هەواو هەوەسەوە قسە ناکات ﷺ بەڵکو ئەوەی دەیڵێ وەحیەو سرووشی بۆ دەکرێ .

---

(١) صحيح اغاثة اللهفان : ٦٤٧.

(٢) الصارم المصلول :٥١٨.

هەروەها عبداللە کوڕی عمرو دەفەرمووێ : ـ من هەموو شتێکم دەنووسی کە لەپێغەمبەری خوام دەبیست تاوەکو لەبەری بکەم، بەڵام سەرانی قورەیش ڕێگەیان لێ گرتم و ووتیان تۆ چۆن هەموو شتێک لەسەری دەنووسی لەکاتێکدا ئەو وەکو ئێمە مرۆڤەو لەکاتی شێنەیی و تورەیی دا قسە دەکات ؟ منیش چیتر قسەکانیم نەنووسیوە تا ئەمەم بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)گێڕایەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەمی پیرۆزی کردو فەرمووی :ـ

**(اكتب فَوَالَّذي نفسي بيده مايَخرُجُ مِنهُ إلَا حَقٌ)**[1].

واتە / بنوسە، سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە لێ ی دەرناچێ جگە لەهەق و ڕاستی .

کەواتە جگە لەهەق و ڕاستی هیچ شتێکی تر لەدەمی پێغەمبەر(ﷺ)دەرناچێ، چونکە ئەرکی پێغەمبەر تەنها ئەوەبووە کە پەیام و بڕیارەکانی خوا بەخەڵکی ڕابگەیەنێت بە ئەوپەڕی ئەمانەت، کەچی بێ باوەڕان دەیان ووت : ئەمە قسەی خۆیەتی و بەدرۆ دیداتە پاڵ خوا، بەڵام خوای گەورە وەڵامی بێ باوەڕانی دایەوە کەوا ئەگەر محمد ئەوەی بکردایە ئەوا ئێمە لێمان قبوڵ نەدەکرد، هەروەکو فەرموویەتی :ـ

**{وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ،لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ، فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ }** الحاقە: ٤٤ – ٤٧

واتە/ ئەگەر محمد (ﷺ)بەدەم ئێمەوە هەندێ ووتەی هەڵبەستایە ‌ بێگومان ئێمە بەدەست و بەهێز تۆڵەمان لێ دەسەند ‌ لەپاشان شادەماری دڵیمان دەبڕی‌ وە کەس لەئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێبکات .

جا (سُبحانَ اللە) سەیری ئەم هەڕەشەیەی خوای پەروەردگار بکەو بیری لێ بکەوە، بۆت ڕوون دەبێتەوە کە خوای گەورە چۆن ئەم قورئانەی پاراستووە، تەنانەت لەچاکترین بەندەو

---

(١) رواه احمد وأبوداود والدارمي والحاكم وهو حديث صحيح.

خۆشەویسترین پێغەمبەری خۆشی قبولْ ناکات کە قسەی بەدەم هەڵببەستیْ.

کەواتە دەبیْ سزاو تۆڵەی خودا بۆ ئەوکەسانە چۆن بیْ کە بەبیْ زانیاری خەڵکی بەخوارو خێچی لەئایین تێدەگەیەنن کە گوایە ئایین هیچ پەیوەندیەکی بەفەرمانڕەوایی وولات نیەو بەناوی خوا قسە دەکەن و کافرو خاچ پەرستان بەبراگەورەو دۆستی ئەم خەڵکە لەقەڵەم دەدەن و داب و نەریت و خووڕەوشتە نزم و خراپەکانی کۆمەڵگای ئەوانیش دێنن و بەسەر ئەم خەڵکە هەژارو موسڵمانە فەرزی دەکەن، هەرکەسێکیش بەرگریان بکات و بیەویْ پێشیان لیْ بگریْ ئەوا بەتیرۆریست و توندڕەو لەقەڵەمی دەدەن و بەچەندین بوختان و تۆمەتی هەڵبەستراو لەپێش چاوی خەڵکی ناشیرینی دەکەن .

هەروەها فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)گەلیْ زۆرن لەسەر ئەو رووداوانەی دوای خۆی ڕای گەیاندووە کە ڕوودەدات و زۆربەی هەرە زۆریان ڕوویان داوە، بەڵام تەنها فەرموودەیەک دەهێنین کە فەرموویەتی : (**صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا : قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا**)(١).

واتە / دوو جۆرە خەڵک هەن کە شوێن و سەرەنجامیان ئاگری دۆزەخەو من ئەم بینیون: یەکێکیان کەسانێکن قامچیان پێیە وەکو کلکی چێلْ، بەم قامچیانە لەخەڵکی دەدەن، ئەوەی تریان کۆمەڵە ئافرەتێکن ئەگەرچی پۆشاکیان لەبەرە بەڵام ڕووتن، سەرنجی پیاوان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن بەم لەنجەو لارو رۆیشتنەی دەیکەن، قژی سەریشیان وەکو کۆپارەی پشتی حوشتر وایە، ئەمانە ناچنە بەهەشت و بۆنی بەهەشتیش ناکەن (لەبەر

(١) رواه مسلم.

دووریان لەبەهەشت) ئەگەرچی بۆنی بەهەشت لەدووری ئەوەندەو ئەوەندەی ڕێگە ڕێوە دێ .

لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێغەمبەر (ﷺ)وەکو بڵێ ی وێنەیەکی ئێستای بۆ خرابێتە پێش چاوی پیرۆزی کاتێک ئەوها بەوردی باسی ئەو خەڵکەمان بۆ دەکات کە لەدوای خۆی پەیدادەبن، بەڵکو باسی کردەوەکان و جل و بەرگیشیان دەکات، کە دەبینین ئێستا ئەم جۆرە خەڵکانە زۆر زۆرن بەڵکو لەم ڕۆژگارەدا باو باوی ئەوانە .




**سێ یەم و چوارەم / گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی و خۆدوورخستنەوە لەو شتانەی ڕێگری لێ کردووە و قەدەغەی کردووە :**

ئەم دوو خاڵە زۆر گرنگن و سەنگی مەحەکن بۆ باوەڕی ڕاستەقینە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)واتە بەقەدەر گوێڕایەڵی کردنی تۆ بۆ پێغەمبەری خواو بە قەدەر دووریت لەو شتانەی قەدەغەی کردووە، باوەڕو خۆشەویستی تۆ بۆپێغەمبەر (ﷺ)دەردەکەوێت .

هەروەها پێویستە گوێڕایەڵی بکرێ لەفەرمانەکانی و قەدەغەکراوەکانیش، چونکە نابێ ئەوەی فەرمانی داوە بەکردنی بکرێو ئەوەی قەدەغەشی کردووە ئەنجام بدرێ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :

{وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا }الحشر: ٧

واتە/ ئەوەی پێغەمبەر پێتان ڕادەسپێرێ ئەنجامی بدەن ئەوەی لێتان قەدەغە دەکات وازی لێ بێنن .

ئەرکی سەرشانی باوەڕدار ئەوەیە لەهەموو ئامۆژگاریەکان و بڕیارەکانی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)بڵێ : **سَمِعنَا وأَطَعنَا** .

واتە / بیستمان و گوێڕایەڵی بووین .

بەپێچەوانەی دووڕووەکان کە بەزوبان دەڵێن ئێمە باوەڕمان هێناوەو پێغەمبەرمان خۆش دەوێت، کەچی کردەوەکانیشیان هەموو سەرپێچی کردنی خوداو پێغەمبەرە (ﷺ)، بۆیە خوای گەورە پێیان دەفەرمووێ {وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ} النور: ٤٧

واتە/ ئەمانە هەرگیز باوەڕدار نین .

چونکە خوای گەورە مەرجێکی داناوە بۆ ڕاستی قسەی ئەو کەسانەی دەڵێن پێغەمبەرمان خۆش دەوێت، کە ئەویش شوێن کەوتنی سوننەت و ڕێبازەکەیەتی، نەک داهێنان (الابتداع)و بەپێش کەوتنی وە گوێڕایەڵی کردنێتی هەروەکو دەفەرمووێ:ـ

{قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ، قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ ۖ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ} آل عمران: ٣١ - ٣٢

واتە/ ئەی محمد (ﷺ) بڵێ : ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت ئەوا شوێن من بکەون، ئەوکاتە خواش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهەکانیشتان خۆش دەبێت، خودا لێخۆشبووی بەبەزەیی یە ۩ بڵێ : گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بکەن ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکردو گوێڕایەڵیان نەکردی ئەوا بێگومان خوداش بێ باوەڕانی خۆش ناوێت.

هەروەها چوونە بەهەشتیش هەر بەگوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (ﷺ)بەستراوەتەوە، هەروەکو فەرموویەتی : -(**من أطاعني دخل الجنة**)[1].

وە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر(ﷺ)گوێڕایەڵی کردنی خودای گەورەیە، چونکە لەڕێگای پێغەمبەرەوە فەرمان و بڕیارەکانی خوای پەروەردگارمان پێ گەیشتووە، هەروەکو لەزۆر ئایەتدا ئاماژەی پێ کراوە ، لەوانە :ـ

{مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ۖ وَمَنْ تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا} النساء: ٨٠

واتە/ هەرکەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)بکات ئەوا بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەرکەسێکیش پشت هەڵبکات ئەوا ئێمە تۆمان نەناردووە بەچاودێرو پارێزەر بەسەریان .

ئینجا دەبێ بزانین کە ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووین لەسەر زمانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)لەتواناو تاقەتی هەموو کەسێک دایە، چونکە خوای گەورە هیچ شتێکی لەسەر بەندەکانی پێویست نەکردووە و ڕانەسپاردوە کە لەسەرووی تواناو تاقەتیان بێت :ـ

{لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا} **البقرة**: ٢٨٦

---

(١) رواه البخاري عن أبي هريرة.

واتە/ خودا داوا لەهیچ کەسێک ناکات مەگەر بەئەندازەی توانای خۆی نەبێ .

**پێنجەم / خۆشویستنی بەبێ زیادە ڕۆیی :-**

خۆشویستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)واجبەو لەدوای خۆشویستنی خودای پەروەردگار دێت (سبحانە وتعالى)هەروەها نیشانەیە بۆ خۆشویستنی خوا چونکە هەر لەبەر خواو بۆ خوا پێغەمبەری خواشمان خۆش دەوێت .

پێغەمبەر کەناڵی پەیوەندی و پردی گەیشتنی بڕیارە پڕ خێرو ڕەحمەتەکانی خوای پەروەردگارە بە مرۆڤەکان، بەشێوەیەک کە ئەم پێغەمبەرە (ﷺ)هەموو ژیانی تەرخان کردو زۆر بە پەرۆشەوە ئەم پەیامەی خودای گەیاندە مرۆڤایەتی کە وەکو روناکی یەک هەموو تاریکیەکانی پێ رەواندەوە، وەکو روحێک لاشەی مردووی مرۆڤایەتی پێ ژیاندەوە، وەکو نەرمە بارانێک خاکە ووشکەکانی پێ تەڕکردەوە، بۆیە پێویست دەکات لەسەر هەموو باوەڕدارێک کە پێغەمبەری خوای لەباوک و منداڵەکانی و هەموو خەڵکی خۆشتر بوێ هەروەکو لەفەرموودەیەکدا فەرموویەتی :-

(**لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ**)[1].

واتە/ باوەڕی نیە هیچ یەکێکتان تاوەکو من لەلای خۆشەویست تر نەبم لەباوکی و کوڕی و هەموو خەڵکی .

بەڵکو دەبێ لەخۆشمان خۆشتر بوێ و هەموو کاتێک ئامادەبین روحمان بەهەرزانی بەقوربان بکەین .

هەروەکو جارێکیان عومەری کوڕی ختاب (خوا لێ ی ڕازی بێ) فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا تۆم لەهەموو شتێک خۆشتر دەوێ تەنها لەخۆم نەبێ .

---

(١) رواه البخاري.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی : نەخێر ، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە (باوەڕت تەواو نابێ) تاوەکو منت لەخۆشت زیاتر خۆش نەوێ

عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی : سوێند بەخوا ئێستا تۆم لەخۆشم زیاتر خۆش دەوێ.

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : **الآن يا عُمر** .

واتە/ ئێستا باوەڕت تەواوە ئەی عمر . رواه البخاري .

**زانایانیش چەند نیشانەیەکیان دیاری کردووە لەخۆشویستنی پێغەمبەر (ﷺ)کە گرنگترینیان ئەمانەن :ـ**

١ – دەبێ ئەو شتەی خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێ تۆش خۆشت بوێ با پێچەوانەی حەزو ئارەزووشت بێ .

هەروەها دەبێ ڕقت لەو شتەش ببێتەوە کە خواو پێغەمبەری خوا ڕقیان لێیەتی با نەفسیشت حەزی لێ بێ .

٢ –فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەی و دووربکەویەوە لەو شتانەی قەدەغەی کردووە .

٣ – خۆت برازێنیەوە لەشێوەو ڕەفتارو گوفتارت بە لاسایی کردنەوەو شوێن پێ هەڵگرتنی سوننەتە بەرزەکانی .

٤ – بەرگری کردن و پشتیوانی کردن و سەرخستنی ڕێبازو پەیام و سوننەتەکەی بەنەفس و ماڵ و منداڵ .

٥ – زۆر صەلەوات و سەلام کردن لێ ی (ﷺ).

بەڵام دەبێ ئاگاداریش بین کە زیادە ڕۆیی نەکەین لەخۆشویستن و پێداهەڵگۆتن بەسەری، بەوەی وابزانین کە پێغەمبەریش (ﷺ)توانیویەتی وەکو خوا سوودو قازانجت پێ بگەیەنێ یان خراپەو ناخۆشیەکت لەسەر لاببات یان وابزانی کە پێغەمبەر هەموو شتێکی لە علم الغيب زانیوە، یاخود وابزانی کە ئەو ئادەمیزاد نەبووە یان وابزانی ئەو لەڕۆناکی دروست بووە، هەروەکو خوای گەورە لەچەندین ئایەتدا لەم ڕاستیانە ئاگادارمان دەکاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)وەکو ئێمە ئادەمیزادبووە بەڵام ئەو نێردراوو هەڵبژاردەی خوا بووە ، هەروەکو فەرموویەتی :ـ

{قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ } فصلت: ٦

واتە/ بڵێ : بەڕاستی من مرۆڤێکم وەک ئێوە، بەڵام من وەحیم بۆ دێت، بۆ ئەوەی بزانن کە پەرستراوی ئێوە خوای تاک و تەنهایە، کەواتە ڕووتان هەر بەرەو خوابێ وە داوای لێبوردنی لێ بکەن، وە سزاو لەناوچوونیش بۆ کەسانی هاوبەش پەیداکەرە .

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :{ قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ ۚ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ } الأعراف: ١٨٨

واتە/ ئەی محمد (ﷺ)بڵێ : من خاوەنی هیچ سوودو زیانێک نیم بۆ خۆم ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، ئەگەر من نادیارو پەنهانەکانم بزانیایە خێرو خۆشی زۆرم بەدەست دەهێناو هیچ خراپەو زیانێکم پێ نەدەگەیی، من تەنها ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ خەڵکانێک کەباوەڕ دەهێنن .

عبداللە کوڕی شخیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : لەگەڵ شاندێکی بەنی عامر چووینە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتمان : تۆ گەورەی ئێمەی .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: گەورە خودایە (تبارک وتعالی) [(١)].

هەروەها دەیفەرموو :ـ (لاتگرونی کما أگرت النصاری ابن مریم فإنما أنا عبدهُ فقولوا : عبدُالله ورسولُه ) [(٢)].

واتە/ زیادەڕۆیی مەکەن لەپێدا هەڵگوتنم هەروەکو نەصارا (گاورە خاچ پەرستەکان) زیادە ڕۆییان کرد لە کوڕی مەریەم چونکە بەڕاستی من بەندەی خودام ، بۆیە ئێوەش بڵێن : بەندەو نێردراوی خودا .

---

(١) حدیث صحیح رواه ابو داود .

(٢) رواه البخاري.

پلەو پایەی بەندایەتیش گەورەترین پلەو پایەیە کە خوای گەورە بە پێغەمبەری بەخشیوە چونکە پێغەمبەر توانیویەتی ببێتە ئەو بەندەیەی فەرمانەکانی خوا بەتەواوی و بەدڵسۆزی جێ بەجێ بکات و پەیامەکەشی بەتەواوی و بێ کەم و کوڕی ڕابگەیەنێت بۆیە لەکاتێک کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ سەرووی ئاسمانەکان و دەگاتە جێگایەک کە تائێستا گەورەترین مەلائیکە کە جوبریلە (علیە السلام)نەگەیشتۆتێ، ئەوجا لە قورئاندا ناوی پێغەمبەر بەبەندە دەهێنێ، وەک پلەوپایەک بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)هەروەکو دەفەرمووێ : -

{سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا } الإسراء: ١

واتە: پاکی و بەرزی بۆ ئەو خودایەی کە شەوڕۆژی کرد بەبەندەکەی .

## بەروبوومی خۆشویستنی پێغەمبەر (ﷺ):ـ

ئەڵبەت بەری داری خۆشویستنی پێغەمبەر (ﷺ)چرو تەڕو بەردەوام و چوار وەرزەیە، وە سوود و کەڵکیشی بۆ هەردوو دونیا هەمە لایەنەیە، جا ئەگەر زانیمان کە یەکێک لەپێویستی و نیشانەکانی خۆشویستنی پێغەمبەر (ﷺ)ئەوەیە کە زۆر سەڵاوات بدەی لەسەری، بابزانین سوودو بەرووبومی سەڵاوات چی یە ؟

ئیمامی ابن الجوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

**(إعلموا رحمكمُ الله أنَ في الصلاة على نبينا محمد (ﷺ)عشر كرامات :**

**إحداهُنَ صلاة الملكِ الجبار والثانية شفاعة النبي المختار**

**والثالثة الإقتداء بالملائكةِ الأبرار، والرابعةُ مُخالَفةُ المنافقين والكفار**

**والخامسةُ مَحوِ الخطايا والأوزار والسادسةُ قَضاءُ الحوائجِ**

**والسابعة تَنويرِ الظواهرِ والأوطار**

**والأسرار والثامنة النجاة مِن عذابِ دار**

**والتاسِعةُ دخول دارِ الراحة البوار**

**والقرار والعاشرة سلامُ الملكِ الغفار**[1]

واتە/ بزانن ڕەحمەتی خواتان لێ بێ کە سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەرمان (ﷺ) دە سوودو ڕێزو دەسکەوتی تێدایە :

(١) بستان الواعظين ورياض السامعين: ٣١٩.

یەکەمیان : سەڵاواتی خودای کردگارە ، دووەمیان تکاو شەفاعەتی پێغەمبەری نازدارە(ﷺ) ، سێ یەمیان پێ هەڵگرتنی مەلائیکەی پاک و پایەدارە، چوارەمیان سەرپێچی کردنی دووڕوو و بێ باوەڕە، پێنجەمیان سڕینەوەی تاوانی تاوانبارە، شەشەمیان جێ بەجێ بوونی پێویستی و پرسیارە،حەوتەمیان ڕووناک بوونەوەی دەروون و ڕووکارە،هەشتەمیان ڕزگاربوون لەسزای زۆرو نالەبارە، نۆهەمیان چوونە ناو ماڵی خۆشی و ئارام دارە، دەیەم سڵاوی خودای پەروەردگارە .

ئینجا لەهەموو بەرووبوومەکانیش شیرین ترو گەورەتر هاوڕێیەتی و هاودەمی پێغەمبەرە (ﷺ) لەبەهەشت لەگەڵ چەندین هاوەڵی بەرێزو شەیدای پێغەمبەر (ﷺ)وەکو (**ثوبان**) (*) کە لەبارەیەوە خودای گەورە فەرموویەتی :

{وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا } النساء: ٦٩

واتە/ هەرکەسێک گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بکات (ﷺ) ئەوا ئەوانە لەگەڵ ئەوکەسانە دەبن کەخوا بەهرەو بەخششی خۆی بەسەردا ڕشتوون لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکان کە بەڕاستی ئەمانە هاوەڵ و هاوڕێ ی چاک و باشن .

تا وە کو عە لی و **ثوبان** بۆ نە بی نە بیە قوربان
شادی ئە و غە مت نە بی چون دە بیە هاوڕێ ی ئە وان ؟
ژیانی پاک و پیرۆزی تە رخان کرد بە دلسۆزی
تا ئوممە ت گومڕا نە بێ توش بە دوای وورگ و ڕۆزی !

---

(*) **ثوبان** ابو عبدالله یان ابو عبدالرحمن کوڕی بُجدُد . هاوڕێ و هاودەمی پێغەمبەر بوو (ﷺ)لەسەفەرو گەشتەکانی ، دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوودەکاتە ناوچەی ڕەملە لەشام پاشان دەچێتە شاری حمص، نزیکەی ١٢٧ فەرمووده لەپێغەمبەر (ﷺ)دەگێڕێتەوە، لەساڵی ٤٥ ی هجری، کۆچی دوایی دەکات . (**تهذيب الاسماء واللغات** - ١٠٣ )



گه ر نیـازت دیتنی ئـه وه     بـۆ حـه زت هه رله خـه وه ؟
چـاوت له پیسـی نـه بـێ     بـه دوای کاروانیان کـه وه

## حوکمی جنێودان و بێ ڕێزی کردن بە پێغەمبەر (ﷺ).

پێچەوانەی خۆشویستن و ڕێزگرتنی پێغەمبەر (ﷺ)، بریتیە لە ڕق لێ بوونەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) یان پەیامەکەی، هەروا بێ ڕێزی کردن و جنێودان بەخۆی یان پەیامەکەی کە یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەکانی باوەڕو موسڵمانەتی، هەروەکو خودای پەروەردگار دەفەرمووێ:-

{يَحْذَرُ الْمُنافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِما فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِؤُا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ ما تَحْذَرُونَ ، وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّما كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآياتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِؤُنَ ، لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمانِكُمْ إِنْ نَعْفُ عَنْ طائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طائِفَةً بِأَنَّهُمْ كانُوا مُجْرِمِينَ} التوبە: ٦٤ - ٦٦

واتە/ دوو ڕووەکان ترسی ئەوەیان هەیە کە سورەتێکی قورئان دابەزێتە سەریان و پەردە لابدا و هەواڵ بدا بەنهێنی و ئەوەی نێو دڵیان ئاشکرا بکات، جا کەواتە ئەی موحەمەد پێیان بڵێ : دەی گاڵتە بکەن و سوکایەتی دەربڕن، دڵنیابن خودا ئەوەی ئێوە ترستان لێ ی هەیە دەری دەخاو ئاشکرای دەکا، ئینجا کاتێکیش لێیان بپرسی : ئێوە بۆچی گاڵتە بەقورئان دەکەن ؟ بۆچی ڕخنە لەپێغەمبەرەکەی دەگرن ؟ بۆچی بە پەنامەکی دژی پەیامەکەی دەدوێن ؟ هەر خێرا دەڵێن : سوێند بەخوا ئێمە هەر بەگاڵتەو بۆ پێکەنین ئەم قسانەمان دەکرد، تۆش پێیان بڵێ : ئایا گاڵتە بەخوداو قورئان و پێغەمبەرەکەی دەکەن ؟ پاساوو پاکانە مەهێننەوە، چونکە ئێوە کوفرێکی ئاشکراتان کردو بێ باوەڕبوون دوای باوەڕهێنانتان، ئەگەر ئێمە لە کۆمەڵێکتان خۆش بین، ئەوا کۆمەڵێکیشتان سزا دەدەین بەهۆی تاوانکاری و سووربوونیان لەسەر تاوانی کوفر ئامێزیان .

ابن تيميه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :-

ئەمە دەقێکە لەسەر ئەوەی تانەو بێ ڕێزی کردن بەخوداو بەئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی کوفرە، ئینجا جنێودانی بە مەبەست لەپێشتریشە، هەروەها ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک سوکایەتی بکا بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)

بە مە بە ست بێ یان بەگاڵتە ئەوا بێ باوەڕ بووە[1] .

هەروەها خودای بەرزی بەتوانا دەفەرمووێ :ــ

{إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا} الأحزاب: ٥٧

واتە :ــ بێ گومان ئەوانەی ئەزیەتی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)دەدەن، خودا دەریان دەکاو بێ بەشیان دەکا لەڕەحمەتی خۆی لەدونیاو دوا ڕۆژ وە ئامادەی کردووە بۆیان سزایەکی ڕیسواکەر .

ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ــ

لە قورئانی پیرۆزدا ئامادەکردنی سزای ڕیسواکەر نەهاتووە تەنها لە دەرهەقی بێ باوەڕان نەبێ[2].

کەواتە جنێودان و بێ ڕێزی کردن بەخودا یان پەیامەکەی، یان پێغەمبەرەکەی (ﷺ)دەرچوون و هەڵگەڕانەوەیە لە ئایین، با ئەوکەسە بڕواشی هەبێ بە پەیام و بەرنامەی خودا، هەروەکو اسحاق کوڕی ڕاهویە، کۆڕای زانایانی هێناوە لەم بابەتە کە دەفەرمووێ :ــ (زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی هەرکەسێک جنێو بدات بەخودا (عز وجل) یان پێغەمبەری خودا (ﷺ) ، یان شتێک ڕەتبکاتەوە لەوەی خودا دایبەزاندووە،

یان پێغەمبەرێک بکوژێ، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی هەبێ بەو قورئانەی خودا دایبەزاندووە ئەوا ئەوکەسە کافرە[3]..

ئەمەش هەڵەی ووتەی مورجیئەکانی دوێنێ و مەدخەلیەکانی ئەمڕۆ دەردەخات کە پێیان وایە دەبێ کەسی جنێودەر بە حەڵاڵی بزانێت ئینجا کافر دەبێت. وە لەمەدا محمد کوڕی سحنون و أبوبکر الفارسی و ابن تیمیە و ابن حزم و ابن عابدین کۆڕای زانایانیان باس کردووە هەروەکو **قاضي عياض** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :

(١) الصارم المسلول على شاتم الرسول : ٢٨.

(٢) الصارم المسلول ٣٥ بەکورتکراوەیی.

(٣) الصارم المسلول : ٤٥١.



نەمان زانیوە کە ڕای جیاو پێچەوانە هەبێ لە ڕەوایی ڕژانی خوێنی جنێودەر بە پێغەمبەر(ﷺ)لەنێوان زانایانی ئێستای ناوچەکان و پێشینە چاکەکانی ئەم ئوممەتە، بەڕاستی زیاتر لەکەسێک باسی کۆڕای زانایانیان کردووە لەسەر کوشتنی جنێودەرو بەکافر دانانی[1].

---

(١) كتاب الشفا (٩٣٣/٢) .

# بەشی شەشەم

## ـ دوو ڕوویی (النفاق) و جۆرەکانی
## ـ تیشکی قورئان لەسەر بیروڕاو ڕەفتاری دووڕووان
## ـ دەرچوون لە گوێڕایەڵی کردن (الفسق)و جۆرەکانی

## دووڕوویی (النفاق) :

**جۆری یەکەمی/ دووڕوویی لەناخ و باوەڕی دڵ (النفاق الاعتقادی).**

بریتیە لەنیشاندانی دووشێوازی ڕوو، وە دووجۆری مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا، کە پێچەوانەی یەکترین .

**نافَقَ**: (**أظهر إيماناً وأخفى كُفراً كذَب**)[1].

واتە : لەڕواڵەتدا باوەڕداری نیشان بداو لەدڵ و دەروونی دا کوفرو بێ باوەڕی بشارێتەوە و لەم بابەتە درۆ بکات .

هەروا لەکردەوەشدا هەموو کردارو دروشمەکانی موسڵمانەتی جێ بەجێ دەکات بەبێ ئەوەی باوەڕی هەبێ بە پێویستی ئەنجام دانی، بەڵکو مەبەستیان خۆپاراستن و خۆ ڕزگارکردنە لەدەست و شمشێری موسڵمانان لەلایەک و بۆ خۆڕزگارکردن لەسەرانەو سزای سەر بێ باوەڕان ئەگەر بێ باوەڕی دەربڕن، هەروەکو خودای پەروەردگار دەفەرمووێ :-

{**اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواعَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ** } المنافقون: ٢

واتە : ئەو سوێندەی کە بەدرۆ دەیانخوارد لەسەر ئەوەی باوەڕیان بە پەیامبەری محمد (ﷺ)هەیە کردبوویان بەقەڵغان و خۆیان پێ دەپاراست، بەمەش ببونە کۆسپ لەڕێگای خوا، بەڕاستی ئەوەی کاری ناپەسندو نابەجێیە ئەنجامیان دەدا .

ئینجا لەبەر مەترسی زیانی زۆریان بۆ موسڵمانان، خودای گەورە زۆر باسی کردوون لە قورئانی پیرۆزو باوەڕدارانی شارەزاو ئاگادار کردۆتەوە بە هەموو سیفات و ڕەفتارو ئاکارو پیلانەکانیان، بەڵکو بەو دوژمنە سەرەکیەی ناوبردوون کە دەبێ موسڵمانان لێیان ئاگاداربن،

---

(١) المعجم الوسيط :٥٦٥.

هەروەکو دەفەرمووێ : {هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ} المنافقون: ٤

واتە/ دوژمن ئەمانەن جا ئاگاداریان بە .

بەڵکو سەیری هەر سورەتێکی قورئانی پیرۆز دەکەی دەبینی کە باسێکی ئەوانی تێدایە، یاخود پیلانێکیان تێیدا ئاشکرا کرایە، وەیان پەردە لەسەر بێ باوەڕییان هەڵدرایە، وەیان ڕووبیانووەکانیان بەتاڵ کرایە، وەیان ئاماژە بە کوفرەکانیان کرایە، دواجاریش سەرەنجامی خۆیان و کردەوەکانیان دیاری کرایە.

ئینجا ئەمانە هەروەکو سەرەتا لە مەککەدا بوونیان نەبوو، چونکە ئەوانەی باوەڕیان دەهێنا دووچاری ئەشکەنجەو ئازارو دەربەدەری دەبوونەوە، بەڵام کاتێک پێغەمبەری خواو (ﷺ)هاوەڵە بەڕێزەکان لەمەدینە دەسەڵاتیان بۆ دروست بوو، ئەمانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان و پاراستنیماڵیان باوەڕییان دەربڕی، لەناخیشیاندا ئەوپەڕی قین و دوژمنایەتیان بۆ باوەڕداران بڕیاردا، بۆیە خودای زاناو شارەزا ئەوەی ئەوان لێ ی دەترسان ئاشکرابێ، ئاشکرای کردووە، هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ} التوبە: ٦٤

لەئێستاشدا کە لەهەموو شوێنێکی سەر ڕووی ئەم زەوییە،کە موسڵمانی تێدا نیشتەجێ یە، ئینجا ئەگەر کەمینەبن وەک لە وڵاتانی ڕۆژئاوا هەن ئەوا دەسەڵاتی بێ باوەڕی ئەم وڵاتانە لەم کەمینە موسڵمانە کەسانی دەروون بەزیوو و دووڕوو بەکاردەهێنێ بۆ سیخوڕی کردن بەسەر موسڵمانەکانی تر. وە لە وڵاتانی موسڵمان نشینیش کە زۆرینەن، کە دەسەڵاتێکی بێ باوەڕی ناوخۆیی فەرمانڕەوایەتێیاندا دیسان دووڕووەکان سەربازی دڵسۆزی نێو سەنگەری پاراستنی ئەم دەسەڵاتەن بە بڵاوبوونەوەیان بەناو موسڵمانان و سیخوڕی کردن و کۆکردنەوەی زانیاری و نهێنی یەکانی موسڵمانان و پێش کەش کردنی بەسەرۆک و سەرانیان،

ئینجا ئەگەر شەیتان بە وەسوەسەو پیلانی خراپ بەناو خوێنی ئادەمیزاددا دەسوڕێ، ئەمانەش بەم شێوەیە بەنێو لەشی ئەم ئوممەتە دەسوڕێن {قَاتَلَهُمُ اللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ} المنافقون: ٤

بۆیە ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ :-

(**كاد القرآن أن يكون كُلّه في شأنهم لكثرتهم على ظهر الارض وفي اجواف القبور**)[1]

واتە : خەریکە قورئان هەمووی لەبارەی ئەوانەوە بێت، لەبەر زۆرییان لەسەر ڕووی زەوی و لەنێو گۆڕەکانیشدا.

هەروا جارێکیان **حذیفە ی** کوڕی یەمان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گوێ ی لێ بوو پیاوێک دەیووت : خودایە دووڕووەکان لەناوببە،

**حوذیفە** فەرمووی :- **يابن أخي لوهلك المنافقون لاستوحشتم في طرقاتكم من قلة السالك** [2].

واتە :- ئەی برازای خۆم ئەگەر دووڕووەکان لەناوبچن، خۆ ئێوەی باوەڕدار زەندەقتان دەچێ لەسەر شەقام و ڕێگاکاندا لەبەر کەمی ژمارەتان کە ماونەتەوە.

جا ئەمە حوذەیفەیە کە خاوەنی نهێنی یەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لەسەردەمی خۆیدا کە سەردەمی پێشینە چاکەکان و چاکترینی سەدەیە ئەم قسەیە دەکات، ئایا ئەگەر لەم سەردەمەدا ژیابا دەبێ چی بووتایە ؟ !!

بۆیە لەبەر زۆرییان و زەرەریان پێویستە موسڵمانان لێیان ئاگاداربن چونکە ئەمانە گورگن لەپێستی مەڕدا، هەر کاتێک کوفر دەسەڵاتی نەبوو ئەمانە بێ ڕەنگ و دەنگن، بەڵام هەردەم دڵ پڕقین و پیلانگێڕی شەوە زەنگن، هەروەکو ووتراوە :- (**قد يفقِدُ الذئبُ أنيابه ولكنه لايفقد طِباعَه** ).

---

(١) تهذيب مدارج السالكين : ١٨٥..

(٢) تهذيب مدارج السالكين: ١٨٥.

واتە : ڕەنگە ڕۆژێک هەبێ گورگ کەڵبەی ددانی لەدەست بدا بەڵام هەرگیز خوونەریتی دڕندانەی لەدەست نادا .

## تیشکی قورئان لەسەر بیروڕاو ڕەفتاری دووڕووان

مەگەر خوونەریتی دڕندانەیان و کوفری شاراوەیی دڵیان نیە کەوای لێ کردوون حەزبکەن کە باوەڕدارانیش وەکو خۆیان کافربن: ـ

{وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً } النساء: ٨٩

لەپێناو ئەم مەبەستەشیاندا گومان و دوودڵی دەخەنە نێو باوەڕداران بەرامبەر بەدەسەڵاتی خوداو بەڵێنەکانی : ـ

**{وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا }** الأحزاب: ١٢

هەروا پێیان وایە ئایینی بێ باوەڕان و جولەکەو گاورو خاچ پەرستان زۆر چاکترو ڕاسترە لەئایینی ئیسلام و پەیامی موسڵمانان، هەروەکو لەئێستاشدا بەشان و باڵی شارستانیەتی ڕۆژئاواو زلهێزەکاندا دەڵێن و ئایینی ئیسلام بەهۆکاری دواکەوتوویی وولاتانی موسڵمان دادەنێن :

**{أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا}** النساء: ٥١

هەربۆیە تانەوتەشەریان لەموسڵمانان و تۆمەت و بوختان هەڵبەستن بۆیان پیشەی کاتی بێ ئیشیان بووە، تەنانەت پێغەمبەری پاک و (ﷺ) خێزانە پاکەکانیشی لەزوبانی ئەم دووڕووانە سەلامەت نەبوون : ـ

{إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ ۚ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ} النور: ١١

بەڵکو ئێستاش هەوڵیان خستۆتە پاڵ هەوڵی دەسەڵاتە ستەمکارو مورتەددەکان و بەهیوان کە بەد ڕەوشتی و داوێن پیسی بەناو باوەڕداران بڵاوبێتەوە :-

{إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ} النور: ١٩

لەلاسارو سەرکەشیشیان هەرکاتێ یادەوەری تەوبەو پەشیمانی بکرێنەوە سەرەلەقە دەکەن و لووت بەرزانە ڕێگری زیاتر دەکەن لەڕێگای خودا :-

**{وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ}** المنافقون: ٥

تەنانەت ئەو نوێژەش کە بۆ ڕیابازی دەیکەن زۆر بەتەمبەڵی و لەش گرانی دەیکەن بەڵکو زۆر بەکەمی یادی خوداش دەکەن :-

{وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا} النساء: ١٤٢

هەرکاتێک موسڵمانانیش ببینن ماڵ ببەخشن لەپێناو خودا، دەست دەکەن بەتوانج لێدان و ڕەخنەگرتن و بەکەم زانینی خێرو چاکەکانیان.

**{الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ}** التوبە: ٧٩

ئینجا خۆ ئەگەر خۆیان ماڵیان بەخشی، چ بەرەزامەندی بێ یان بەزۆر، خودا لێیان قبوڵ ناکات، چونکە هەرگیز باوەڕیان پێی نەبووەو بەپێ ناخۆشی و داخی دڵیانەوە دەیانبەخشی :-

**{وَلَا يَأْتُونَ الصَّلَاةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَارِهُونَ}** التوبە: ٥٤

بەڵکو زۆریشیان پێناخۆش بوو کاتێک کەسانێک ماڵیان دەبەخشیەوە سەر ئەو هاوەڵە هەژارانەی لەدەوری پێغەمبەردا (ﷺ)کۆدەبوونەوە، تاوەکو لەنەبوونی و هەژاری پێغەمبەرەکەیان

(ﷺ)وانەی ئارامگری و خۆڕاگری و ڕەزامەندی لەسەر قەدەری خوا فێرببن، بەڵام دووڕووەکان دەیانووت ماڵ مەبەخشن بەمانە :ـ

{هُـمُ الَّـذِينَ يَقُولُـونَ لَا تُنفِقُـوا عَلَـىٰ مَـنْ عِنـدَ رَسُـولِ اللَّهِ حَتَّـىٰ يَنفَضُّوا} المنافقون: ٧

بەگشتی هەرکەڵک و سودێکی دونیایی بگات بە موسڵمانان، ئەوان دڵیان پێ ی تەنگ دەبێ و خەمبار ئەبن پێیەوە، کەچی هەرکاتێک ناخۆشی و نەهامەتیەک بە موسڵمانان بگات، ئەوان دەڵێن ئێمە ئاگاداربووین و هۆکاری خۆپاراستنمان دەستەبەر کردبوو ئینجا بەدڵخۆشیەوە پشت هەڵدەکەن و یارمەتی موسڵمانان نادەن :ـ

{إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا وَّهُمْ فَرِحُونَ} التوبە: ٥٠

بەردەوام ترسیان لەو ڕۆژەیە کە موسڵمانان دەسەڵاتیان بکەوێتە دەست، بۆیە هەرکاتێک ببینن موسڵمانان کۆمەڵ و پێشەوایەکیان بۆدروست بووە و یەک ڕیزیان پێوە دیارە، بە پەلە خۆیان دەخزێننە ناو ئەم یەک ڕیزی یەو بە هەڵبەستنی درۆو قسەی بێ بنەما هەوڵی نانەوەی ناکۆکی و پەرتەوازەیی موسڵمانان دەدەن:ـ

{لَـوْ خَرَجُـوا فِـيكُم مَـا زَادُوكُـمْ إِلَّا خَبَـالًا وَلَأَوْضَـعُوا خِلَالَكُـمْ يَبْغُـونَكُمُ الْفِتْنَةَ.......

بەڵام کێشە ئەوەیە کە لەناو موسڵمانانیش کەسانێک هەن گوێیان بۆ ڕادەگرن،

{........ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ } التوبە: ٤٧

خۆ ئەگەر موسڵمانان سووربوون لەسەر گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ شەریعەتی خودا و سوپایان بۆ ئەم مەبەستە بەڕێ کرد، ئەم جا بروبیانووی ناڕەوا بۆ پاشەکشەو خۆدزینەوە دەهێننەوە :ـ

{وَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ آمِنُوا بِاللَّهِ وَجَاهِدُوا مَعَ رَسُولِهِ اسْتَأْذَنَكَ أُولُو الطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا ذَرْنَا نَكُن مَّعَ الْقَاعِدِينَ} التوبە: ٨٦

ئینجا جارێک دەیانووت : ماڵەکانمان بەدەرەوەیە و ترسی هەڵکوتانی دوژمنمان لەسەریەتی.
{يَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ} الأحزاب: ١٣

بەڵام خودا دەفەرمووێ : تەنها مەبەستیان هەڵاتن و خۆ ڕزگارکردنە.

وەیاخود دەیانووت ئەگەر بزانین شەڕو جەنگ بەرپا دەبێ شوێنتان دەکەوین: ـ

{قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ} آل عمران: ١٦٧

بەڵام خودا دەفەرمووێ: ئەوان لەم ڕۆژەدا لەکوفر نزیکترن وەک لەباوەڕ، وەیان جارێکی تر دەیان ووت: ئەگەر بمانتوانیبایە لەگەڵتان دەردەچووین و دەهاتین بۆ جەنگ، سوێند بەخوا ناتوانین : ـ { وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ} التوبە: ٤٢

بەڵام خودا دەفەرمووێ : خۆیان بەدەرد و لەناوچوون ئەبەن و درۆ ئەکەن.

وەیان دەیان ووت : ـ لەگەرماو تینی هاویندا دەرمەچن بۆ جیهاد : ـ
{لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ} التوبە: ٨١

بەڵام خودا دەفەرمووێ : ـ ئاگری دۆزەخ بەتین و گەرمترە ئەگەر بزانن .

کەواتە ئەمانە هەر لەسەرەتاوە ئەگەر مەبەستیان دەرچوون بوایە بۆ جیهاد ئەوا خۆیان بۆ ئامادە دەکرد بەمەشق و ڕاهێنان لەسەر هونەرەکانی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام خودا دەرچوونی ئەوانی نەویست، لەبەرئەوە سست و لەشی قورس کردن و پێیان ووترا : دانیشن بۆخۆتان لەگەڵ پیرومناڵ و پەککەوتەکاندا .
{وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ} التوبە: ٤٦

جا کە نوێژ مافی خوایەو جیهادیش هۆکاری پاراستنی ئاینی خودایە، ئەمانە لەهەردووکیاندا لەش گران و بێ زاخن، لەکاتێ باسی جیهادو کوشتار دێتە گۆڕێ، چاویان دەسوڕێ و ڕەنگیان دەگۆڕێ هەروەک یەکێ لەڕوحدان و دواساتی ژیانی بێ .

{فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنْظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ} الأحزاب: ١٩

ئینجا دوای ئەوەی ترس و بیمی جەنگ و جیهاد لەسەریان نەما، بەزمانە درێژو تیژەکانیان دەتاندەنە بەر قسەی ڕەق و ناخۆش و ئازارتان دەدەن .

{إِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُمْ بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ} الأحزاب: ١٩

لەکاتی شێنەیی دا زۆرخۆیان لەباوەڕداران دڵسوزتر نیشان دەدەن و سوێند دەخۆن کە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ)یان گەورەی موسڵمانان داوایان لێبکات ئەوا دەردەچن لەگەڵیدا بۆ جیهاد .

{وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ} النور: ٥٣

بەڵام خودا دەفەرمووێ : پێیان بڵێ : سوێند مەخۆن چونکە گوێڕایەڵی کردنی ئێوە دیارو ئاشکرایە کە تەنها لەکاتێکدا دەردەچن بۆ جیهاد ئەگەربەرژەوەندیەکتان تێدا ببیننەوە :

{ قُل لَّا تُقْسِمُوا ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ } النور: ٥٣

جا سەیرە کە باوەڕدار لەگەڵ ئەوەی خاوەن کردارە، بەڵام دەبینی بەردەوام لەسەرەنجامی کردەوەکانی دەترسێ و غەمبارە، کەچی دووڕوو سەرەڕای ئەوەی بێ کردەوەو دەست بەتاڵە، کەچی بەردەوام دڵنیایەو ئاوات دارە، هەروەکو تابعی بەڕێز حسن البصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ(( باوەڕدار لەهەموو خەڵک کردەوەی چاکترە، لە هەموو خەڵکیش زیاتر دەترسێ کە لێ ی وەرنەگیرێ، ئەگەر بەئەندازەی کێوێک ماڵ ببەخشێ دڵنیانیە کە لێ ی وەرگیراوە هەتا نەیبینێ، هەرچەند چاکەوخواپەرستی زیادبکات ئەوەندە ترسی زیاتر دەبێ و دەڵێ : ڕزگارم نابێ، بەڵام دووڕوو دەڵێ : خەڵکی گوناهبار زۆرەو خوا لێم خۆش دەبێ و هیچم

لەسەرنیە، بۆیە کردەوە لەبیردەکات و ئاوات و ئومێدی بەتاڵ لەسەر خوا دادەنیَ)) [١]

بەڵام دەغەڵ و دووڕووەکانی ئەمڕۆ زۆرخراپترو زەرەریان زۆر زیاترە لە دووڕووەکانی ڕابردوو، هەروەکو شارەزاترین کەس دوای پێغەمبەر(ﷺ) بەدووڕووەکان، کە حوذەیفەی کوڕی یەمانە (ڕەزای خوای لیَ بیَ) دەفەرمووێ :-

**(إن المنافقين اليوم شرٌ منهم على عَهدِ النبي (ﷺ) كانوا يومئذٍ يُسِرُون واليومَ يجهرون)** [٢]

واتە: بەڕاستی دووڕووەکانی ئەمڕۆ خراپترن لەوانەی لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، چونکە ئەوان کوفرەکەیان دەشاردەوە، بەڵام ئەمانەی ئەمڕۆ بەئاشکرا دەیڵێن و دەیکەن .

ڕیوایەتێکی تر دەفەرمووێ : **(إنما كان النفاق علَى عَهدِ النبي (ﷺ) فأما اليوم فإنما هو الكُفرُ بعد الإيمان)** [٣].

واتە : دووڕوویی (شاردنەوەی بیَ باوەڕی) لەسەردەمی پێغەمبەردابوو بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ کوفرە دوای باوەڕهێنان .

منیش دەڵێم بیَ گومان دەغەڵ و دووڕووەکانی ئەمڕۆ زۆر خراپترن لەوانەی سەردەمی حوذەیفە (ڕەزای خوای لیَ بیَ) چونکە ئەوان دەریاندەبڕی بەڵام ئەمانەی ئێستا ڕێگەنادەن سەرانی کوفریان ماندووبن، بەڵکو خۆیان کاری ئەشکەنجەدانی موسڵمانان ئەنجام دەدەن و بەپێش سوپاو دەزگا هەواڵگیریەکانی تاغوت و زۆردارەکان دەکەون بۆسیخوڕی کردن بەسەر موسڵمانان و ڕفاندن و ڕادەستکردنیان بەدوژمنانی ئیسلام .

## جۆری دووەمی/ دووڕوویی تەنها لەئاکارو ڕەفتارە .

---

(١) حلية الاولياء ابونعيم الاصفهاني (١٥٣/٢)..

(٢) رواه البخاري (٧١١٣) ..

(٣) رواه البخاري (٧١١٤).



هەروەکو زانایانی موسڵمانان لەباسی ئەم جۆرە ناویان ناوە دووڕوویی لەکردەوە (**النفاق العملي**) کە بریتیە لەوەی کارو رەفتارێک ئەنجام بدا، کە دووڕووەکان پێوەی ناسراون، ئەم کارو رەفتارانەش بێ گومان تاوانن، بەڵام ناگەن بەپلەی شرک و کوفر، هەروەک بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کەباس لەسێ (**آية**) دەکات، (**آية**) ش بەمانای نیشانەیەکە دیارەو دەبینرێ.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێ :-

( **آية المنافق ثلاث : إذا حدّث كَذَبَ ، وإذا وَعَدَ أخلف ، وإذا اؤتُمِن خان** ) [(١)].

واتە : نیشانەی دووڕوو سێ یە : کاتێک قسەی کرد درۆبکات، کاتێک بەڵێنی دا بەجێ ی نەگەیاند،، ئەگەر سپاردەیەکی لەلا دابنرێت ناپاکی کرد تێیدا .

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە کە دەفەرمووێ :-

( **أربعُ خلالٍ مَن كُنَ فيه كان منافقاً خالصاً : مَن إذا حدث كذب ، وإذا وعد أخلفَ وإذا عاهد غدر وإذا خاصم فجر، ومن كانت فيه خصلةٌ منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يَدَعَها** ) [(٢)].

واتە : چوار ئاکارهەن هەرکەسێک تێیدابن ئەوا بەتەواوەتی چووەتە سەر رەوشتی دووڕوو: کەسێ ئەگەر قسەی کرد درۆبکات، ئەگەر بەڵێنی دا بەجێ ی نەگەیەنێ، ئەگەر پەیمانی دا شکاندی، ئەگەر ناکۆکی بوو لەگەڵ کەسێکدا تاوانبکات و نێوانەکە تێک بدات. ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ : مانای (**کان منافقاً خالصاً**) واتە : زۆر بە دووڕووەکان دەچێ بەهۆی ئەم ئاکارو رەوشتانە [(٣)]..

---

(١) رواه البخاري ومسلم.

(٢) رواه البخاري ومسلم.

(٣) صحيح مسلم بشرح النووي (٦٦٥/١).

**ابــو عيســـى الترمــذي** (ڕەحمــەتی خــوای لــێ بــێ) مانــای ئــەم فەرموودەیــەی لەزانایانــەوە هێناوەتــەوە بەشــێوەیەکی ڕەهــا کــە دەفەرمووێ :ـ

(( مانای ئەم فەرموودەیە لەلای زانایان دووڕوویی کردەوەیە )) [١].

ئینجـا بـاوەڕداری ڕاسـتەقینە دەبـێ بـەردەوام خـەریکی پـاک کردنــەوەو پاڵفتــەکردنی ئاکــارو ڕەفتارەکــانی بــێ نــەبادا لەشتێکدا چووبێتە ڕیزی دووڕووەکان و نەزانی، هەروەکو تابعی بەڕێز **ابن أبي مليكة** (ڕەحمەتی خولی لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

( **أدركتُ ثلاثين من أصحاب النبي (ﷺ) كُلُّهُم يخشى النفاق على نَفسِهِ** ) [٢]

واتــە : گەیشــتم بــە (٣٠) کــەس لــەهاوەڵانی پێغەمبــەر (ﷺ) هەموویان لە دووڕوویی دەترسان لەخۆیان .

## دەرچوون لەگوێڕایەڵی (الفسق)

ئــەم زاراوەش وەکــو زاراوەکــانی پێشــووی وەک (الشــرک، الکفر، النفاق) دووبەشی سەرەکی یە:ـ

### ١ -(**الفسق الأكبر**) أو (**فسق مخرج عن الملة**) :-

واتـــە/ دەرچـــوونی گـــەورە لەگوێڕایـــەڵی یـــان دەرچـــوونێک کەخاوەنەکەی دەربکات لەئیسلام.

بێ گومان یەکەم کەس کە لەگوێڕایەڵی کردنی خودای گەورە دەرچوو ئیبلیسی نەفرەت لێکراوبوو، کاتێک مافی ئەوەی بەخۆی دا (بەستەم) کە لەبەرامبەر فەرمانەکانی خودای گەورە هەڵبـژاردن (اختیـار) بکـات و ڕای تایبـەتی هـەبێت خـودای گـەورە لەبارەیەوە دەفەرمووێ :ـ {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ} الكهف: ٥٠

---

(١) صحيح مسلم بشرح النووي (٦٦٥/١).

(٢) صحيح البخاري – كتاب الإيمان: ١٦.

واتـە / کاتێـک بـە مەلائیکەتـەکانمان ووت : سـوژدە ببـەن بـۆ ئـادەم هـەموویان سـوژدەیان بـرد تـەنها ئیبلـیس نـەبێ کـە لەجنۆکـەکان بـوو دەرچـوو لەگوێڕایـەڵی کردنـی بڕیـاری پەروەردگاری.

ئینجا بەدوای ئەویشەوە هەموو ئەوبێ باوەڕانەی مل کەچ نابن بۆ ئـەو ئایەتانـەی لەلایـەن خـوداوە دادەبـەزێت و بـەدرۆی دەخەنـەوە، هەروەکو دەفەرمووێ :-

{وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ} **البقرة**: ٩٩

واتە /سوێند بەخوا گومان لەوەدانیە کە ئێمە ئایەت و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرامان بۆتۆ دابەزاندووە و بێ باوەڕنیە پێیـان تـەنها ئەوانـە نەبێ کە گوێڕایەڵی ناکەن و دەرچوونە لەفەرمانەکانمان .

بۆیـە لەبـەردەوام بوونیشـیان لـەم پشـت کـردن و گوێڕایـەڵی نەکردنـەو سەرپێچـی یـەیان بـۆ پێغەمبـەران (علیهم السلام) زیـاتر تووشی حەپەساوی و سەرگەردانی بـوون لەمـەڕ ئایەتـەکان و نموونـە هێنانەوەی خودای گەورە و دەیانووت (( **ماذا أراد اللهُ بهذا مثلا** )) ئایا دەبێ مەبەستی خودای گەورە چی بێ لەمەدا ؟

بۆیە لەدابەزینی هەر ئایەت و سورەتێک ئەمان کوفرو ڕقیـان زیـاد دەبوو، بەپێچەوانەی باوەڕداران کە باوەڕو دڵنیاییـان پـێ زیـاتر دەبـوو، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

{وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِ إِيمَانًا ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ، وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ}التوبه: ١٢٤ – ١٢٥

واتـە/ هـەرکاتێک سـورەتێک دابـەزێت لـە دووڕووەکـان کەسانێک هەن دەڵێن : کامتـان بـەم سورەتە باوەڕی زیادبووە ؟ جا ئەوانەی باەڕیان هێناوە باوەڕیان بەهۆیەوە زیاد دەبێ و مژدە بەیەکتر دەدەن لەسەر ئەو بەهرەیەی خودا، لەسـەر ئـەوەش کـە یارمـەتی داون بۆ تێگەیشتنی و کارپێ کردنی، بەڵام ئەوانەی نەخۆشی گومان و دووڕوویـی لەدڵیانـدا هەیـە ئـەوا نەخۆشـی و گومـانی زیـاتر لەسـەر

نەخۆشی گومانی خۆیان زیاد دەبێ بەهۆی بێ باوەڕی و سەرکەشی و پشت کردنیان بەمەش بەرەو لەناوچوونی بردن و تا سەرەنجام بەبێ باوەڕی مردن .

کەواتە بڕیاری خودا بەسەریان دادوەرانەیە کە لەئەوپەڕی زانیاری و حیکمەتی خۆی پێیان فەرمووی :ـ {وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ } **البقرة**: ٢٦

واتە/ تەنها ئەوانە پێیەوە گومڕا دەبن کە دەرچوونە لەگوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خودا، دەرچوونێک کە لەباوەڕیش دەریخستن و شیاو نەبوون بۆ ڕێگای ڕاست و ڕێنمایی.

**٢ – (الفسق الأصغر) أو (فسق غير مخرج عن الملة) :ـ**

ئەم جۆرەیان هەموو ئەو گوناهو تاوانانە دەگرێتەوە کە باوەڕدار ئەنجامیان دەدات و ناگەن بەپلەی کوفرو دەرچوون لە ئایین .

هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ } الحجرات: ٦

واتە/ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێک هەواڵێکی بۆهێنان ئەوا ڕوونی بکەنەوە و دڵنیابن لەڕاستی هەواڵەکە نەبادا دەستتان بکەوێتە سەر خەڵکێک بەنەزانی کە دواجار تووشی پەشیمانی دەبنەوە لەسەر کارەکەتان .

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :ـ

{فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ} **البقرة**: ١٩٧

واتە/جا ئەوەی لەو مانگانەدا بڕیاری دا حەج بکات و دەستبەکاربوو، ئەوا بانزیکی هاوسەرەکەی نەکەوێت و شەڕەچەپۆک و گوناهو گفتۆگۆی نادروست ئەنجام نەدات . یاخود ئەو شێوازانەی کە لەفەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە، لەوانەش : (**سبابُ المُسلِمِ فُسوقٌ وقِتالُهُ كُفر**)[1].

---

(١) رواه مسلم.



واتە/ جنێودان بە موسڵمان دەرچوونە (دەرچوونە لە گوێڕایەڵی کردنی ئەو فەرمانانەی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرمان ئەکەن بەڕێزگرتن و خۆشویستن و مامەڵەی جوان بەرامبەر موسڵمانان)وە شەڕکردن لەگەڵیشی کوفرە (بێ گومان ئەو کوفرەیە کە خاوەنەکەی پێیەوە لەئیسلام دەرناچێ ) .

## بەشی حەوتەم

- پلەو پایەو گەورەیی تەنها خواپەرستی
- چوار بناغەی کارو سێ بنچینەی باوەڕ
- ڕوکنەکانی ئیسلام و بەڵگەکانی
- پێگەی نوێژ لەباوەڕو حوکمی نوێژنەکەر

## پلەوپایەو گەورەیی تەنها خواپەرستی
## (فضل التوحید)

باوەڕهێنان و ناسین و پەرستنی خودای تەنها ئەو ئامانجە گەورەو پیرۆزەیە کە لەپێناویدا خودا بوون و بوونەوەری بەدی هێنا، پەیام بەرو پێغەمبەرانی خۆی پێیەوە ڕەوانە کردو پەیام و بەرنامەی خۆی بۆیان دابەزاند، چاکی و بەرزی ئەم ئوممەتەش لەوەدایە کە لەدوای پێغەمبەر (ﷺ)هاوەڵان و لەدوای ئەوانیش زانایان و بانگخوازانی ئەم مەبەست و ڕێیە، تا ڕۆژی دوایی هەریەکەو بەپێی ئەو توانایەی خودا پێی دایە، بوون بەنوێنەرو گەیەنەری پەیامی پێغەمبەران بۆ ئەو خەڵکە، تابتوانن زۆرترین کەس ڕزگاربکەن لەو تاریکاییانەو تەنگ و کۆسپانەی وا لەرێگای چوونە بەهەشتیاندایە، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ)کاتێ **معاذي** کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو : (**فليكن أول ماتدعوهم إلى أن يُوَحِدُوا الله تعالى**..)[1].

واتە : با یەکەم شت کە بانگیان دەکەی بۆلای ئەوەبێ کە خودای گەورە بەتاک و تەنهایی بناسن و باوەڕی پێ بهێنن .

فەرموودەی یەکەم :

((**عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ** (رضي الله عنه)**قال، قال رَسُولِ اللَّهِ** (ﷺ) : **مَنْ شَهدَ أنْ لا إلَهَ إلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ ، وَأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ : وَأنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ ، وَكَلِمَتُهُ ألْقَاهَا إلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ ، والْجَنَّةَ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ ، أدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ على ماكان مِنَ العمل** ))[2]

ئیمامی أحمد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

**وَكَلِمَتُهُ** : واتە ئەو ووشەیەی کە خودای گەورە عیسای کوڕی مەریەمی پێوە دروست کرد

---

(١) رواه البخاري.

(٢) رواه البخاري ومسلم.

کاتێ فەرمووی (کُن) واتە : ببە، کەواتە (کُن) ووشەی خودایە نەک عیسابێ هەروەکو خاچ پەرستان و تاقمی جەهمیەکان لەبارەی عیساوە درۆیان بەدەم خوداوە کرد[1]..

واتە/ هەرکەسێک شایەتی بدات کەهیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە اللّه کە تەنهایەو هاوتای نیەو محمد (ﷺ)بەندەو نێردراوی خوایە وە عیسا بەندەو نێردراویەتی و ووشەی خوایە کەبەسەر مەریەم دا دراوە و ڕوحێکە لەلایەن خواوە، بەهەشت ڕاستەو ئاگر ڕاستە، ئەوا خودای گەورە دەیخاتە ناو بەهەشت هەرچەند گوناهیشی زۆربن .

چونکە باوەڕداری خواپەرست خۆشەویسترین شتی ئەنجام داوە لەلای خودا کە بەتاک و تەنها پەرستنی خوداو هاوەڵ دانەنانە بۆی، بۆیە بەوهۆیەوە هەرچەندی گوناهی هەبێ خودا لێ ی خۆش دەبێت و ئازاری نادات بەئاگر بەڵکو لاشەی حەرام دەکات لەسەر ئاگری دۆزەخ .

فەرموودەی دووەم :-

**((عن معاذ بن جبل (رضي اللّه عنه) قال : كُنتُ رَدِفَ النبي (ﷺ)على حِمارٍ قالَ : فقال : يا مُعاذ، تدري ماحَقُ اللّهِ على العِباد وما حَقُ العبادِ على اللّه ؟ قال : قلت : اللّهُ ورسولَه أعلم قال : فإنَ حَقَ اللّهِ على العِباد أن يعبُدوا اللّهَ ولايُشركوا به شيئاً، وحَقُ العبادِ على اللّهِ عزوجل ألّا يُعَذِبَ مَن لايُشرِك به شيئاً، قال : قُلتُ : يا رسول اللّه، أفلا أُبَشِرُ الناس ؟ قال: لاتُبَشِرهُم فيَتكِلُوا ))**[2].

واتە / لە معاذ کوڕی جبل گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی : من لەدوای پێغەمبەر (ﷺ)لەسەر پشتی گوێ درێژێک بووین دەڵێ ووتی : ئەی معاژدەزانی هەقی خودا چیە لەسەر بەندەکانی و هەقی بەندەکانیش چیە لەسەر خودای گەورە ؟

دەڵێ : ووتم : خوداو پێغەمبەری خوا (ﷺ)زاناترن، فەرمووی : بەڕاستی هەقی خودا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە بەتەنها

(١) سه يرى كتابى فتح المجيد : ٤١ بكه .

(٢) رواه البخاري ومسلم.

بیپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنێن، وە هەقی بەندەکانیش لەسەر خودای بەرزو گەورە ئەوەیە کە سزاو ئازاری ئەوکەسە نەدا کەهیچ هاوبەشی بۆ دانەنابێ، دەڵێ : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئایا مژدە نەدەم بەخەڵکی؟ فەرمووی : مژدەیان پێ مەدە نەبادا پشتی لێ بکەنەوەو واز لەکردەوە بهێنن .

فەرموودەی سێ یەم :ـ

**عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنهما) قال : قال رسول الله (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، فَيَنشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا ، كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلَ مَدِّ الْبَصَرِ ، ثُمَّ يَقُولُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا ؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ ؟ فَيَقُولُ : لَا يَا رَبِّ ! فَيَقُولُ : أَفَلَكَ عُذْرٌ ؟ قَالَ : لَا يَا رَبِّ ! فَيَقُولُ : بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً ، فَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ ، فَتُخْرَجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَأَشهدُأن مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، فَيَقُولُ : احْضُرْ وَزْنَكَ ، فَيَقُولُ : يَا رَبِّ ! مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ ؟ فَقَال : إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ ، قَالَ : فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كِفَّةٍ ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ ، فَطَاشَتِ السِّجِلَّاتُ وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ " فَلَا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ))** (١).

واتە/ بەڕاستی خودای گەورە کەسێک ڕزگار دەکات لە ئوممەتەکەم لەناو هەموو دروستکراوەکان لەڕۆژی دوایی جا نەوەدو نۆ پەڕاوی لەبەردەم بڵاوە دەکرێت (لەتاوانەکانی) کە هەر پەڕاوێک بە ئەندازەی بینینی چاوە پاشان دەفەرمووێ :ـ

ئایا نکوڵی دەکەی لەهیچ شتێکی تێیدا ؟ ئایا مەلائیکە نوسەرەکانم ستەمیان لێ کردووی ؟ ئەویش دەڵێ نەخێر ئەی پەروەردگارم ،

دەفەرمووێ : ئایا هیچ بەهانەیەکت هەیە ؟ ئەویش دەڵێ : نەخێر ئەی پەروەردگارم ،

خودا دەفەرمووێ : بەڵکو تۆ لەلای ئێمە چاکەیەکت هەیەو

(١) حديث صحيح، رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي ورواه الترمذي وابن ماجه وصححه الالباني في : ٣٦٦/١ برقم ١٧٧٦.

ئەمڕۆ ستەمت لێ ناکرێ، ئینجا کارتێک دەردەهێنن تێیدایە کە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە (اللە )وە شایەتی دەدەم کە محمد بەندەو نێردراوی خوایە، ئینجا خوا دەفەرمووێ : کێشانەکەت ئامادە بکە،

ئەویش دەڵێ : ئەی پەروەردگارم جا ئەو کارتە چیە کە بکێشرێ لەگەڵ ئەم پەڕاوانە ؟ خوا دەفەرمووێ : تۆ هەرگیز ستەمت لێ ناکرێ، ئینجا پەڕاوەکان هەمووی لەتای تەرازوویێک دادەنرێت و کارتەکەش لەتاکەی تری تەرازووەکە، یەکسەر پەڕاوەکان سووک دەبن و بەرزدەبنەوەو کارتەکە قورس دەبێت، چونکە هیچ شتێک لەبەرامبەر ناوی خودا قورس نابێت .

فەرموودەی چوارەم :-

((**قَالَ اللّهُ-تبارك وتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ، إِنّكَ مَا دَعَوتَنِيْ وَرَجَوتَنِيْ غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ مِنْكَ وَلا أُبَالِيْ، يَا ابْنَ آدَمَ لَو بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السّمَاءِ ثُمّ استَغْفَرْتَنِيْ غَفَرْتُ لَكَ، ولا أبالي ، يَا ابْنَ آدَمَ إِنّكَ لَو أَتَيْتَنِيْ بِقِرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا ثُمّ لَقِيْتَنِيْ لاَتُشْرِك بِيْ شَيْئًا لأَتَيْتُكَ بِقِرَابِهَا مَغْفِرَةً**))(١) .

ئەم فەرموودەیە قودسی یە و خوای گەورە دەفەرمووێ : ئەی نەوەی ئادەم : بێگومان تۆ تا لێم بپاڕییەوە و تکام لێ بکەی لێت خۆش دەبم لەهەر شتێک کە هەتبێ و بێ باکم لێ ی ، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر تاوان و گوناهەکانت بگەنە ناخی ئاسمان پاشان داوای لێخۆشبوونم لێ بکەی لێت خۆش دەبم و باکم نیە، ئەی نەوەی ئادەم تۆ ئەگەر بەقەبارەی زەوی بەگوناهەکانت بێیەوەلام بەڵام کە پێم گەیشتی هیچ هاوبەشت بۆ دانەنابم ئەوا منیش بەقەبارەی گوناهەکانت بەلێخۆشبوون دێمەلات .

لە دە ریای پر دورو مرواری بە هاداری
ئاخۆ دە بێ نرخی بە ردیک چی بێ کە وتۆتە ژێریا
گە رحە وت تاق و زە وی سووک بێ لە ئاستی
دە بێ بە های روحمان چی بێ بە رامبە رو لە ئاستیا

---

(١) أخرجه الترمذي ومسلم والطبراني وهو حديث صحيح.



گه ر ته وحيده مه به ستت له خه لقی مه خلوقاتی
بێ به هايه چی سه رمايه بەڵكو روحيش له پێشيا
پر به فراوانی ئاسمانه كانت گوناهم هه بێ
ليم خۆش ده بی بێ باكی گه ر بتپه رستم به ته نيا
به قورسايی و قولايی زه ويه كه ت تاوانم بێ
لێم ده بوری باكت نيه تۆی كه هيچ هاوتات نيا

## چوار بناغەی کارو سێ بنچینەی باوەڕ

پێویستە لەسەرمان و ئەرکی سەرشانمانە کە :ـ

یەکەم :ـ زانست و زانیاریمان هەبێ، لەناسینی خوداو ئایینەکەی کە ئیسلامەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) .

دووەم :ـ کار بەو زانستە بکەین .

سێ یەم:ـ بانگەوازی بۆ بکەین، خەڵکی بانگ بکەین تا بێنەوە ژێر سایەو سێبەری ئیسلام .

چوارەم :ـ ئارام بگرین لەهەر ناخۆشی و ئازارێک کە لەو ڕێگەیەدا تووشمان دێت، ئەمانەش هەمووی بەبەڵگەی ئایەتەکانی سورەی العصر کە خوای گەورە فەرموویەتی :ـ {وَالْعَصْرِ. إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ. إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ} العصر: ١ - ٣

واتە/ سوێند بەکات ، بەڕاستی مرۆڤ لەزیان و زەرەر مەندی دایە، جگە لەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان ئەنجام داوەو ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەسەر هەق و ڕاستی وە ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە لەسەر ئارام گرتن لەسەری .

کەواتە گرنگترین زانست و زانیاری کە پێویستە هەتبێ بریتیە لەناسینی خوداو پێغەمبەرەکەی و ئایینەکەی کە ئیسلامە بۆیە زانایان بە بنچینە دایان ناوە بۆ بیروباوەڕی موسڵمان :ـ

بنچینەی یەکەم : ناسینی خودای پەروەردگار .

بنچینەی دووەم : ناسینی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) .

بنچینەی سێ یەم : ناسینی ئایینەکەی کەئیسلامە .

هەموو مرۆڤێکیش کە دەمرێ و پێ دەنێتە یەکەم مەنزڵگای دواڕۆژ کە گۆڕەکەیەتی، پرسیاری لێ دەکرێ لەسەر ئەم سێ بنچینەیە کە ئایا چی پەرستووە ؟ لەسەر چ ئایینێک بووە ؟ بەشوێن کێ کەوتووە ؟



## پایەی ئیسلام و ڕوکنەکانی

ئیسلام کۆتا ئایینە کە خوای پەروەردگار لەڕێگای کۆتا پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کۆتا ئوممەت تا کۆتایی سەردەم ڕەوانەی کردووەو سەرەنجامی دەسەڵاتی دونیاشی تەنها بۆ ئەم ئایینە نووسیوە، ڕازی بووە کە ئەم ئایینە تارۆژی دوایی تاکە ئایین و ڕێبازی خەڵک بێ و جگە لەم ئایینە ڕۆژی دوایی هیچ ئایینێکی تر لەم خەڵکە وەرناگرێ کە پێیان گەیشتووە .

ئیسلام واتە خۆسپاردن و مل کەچ بوون بۆ خودای گەورە لەمیانەی پەیڕەوکردنی بڕیارو بەرنامەی ئایینی ئیسلام بەگشتی و بەرجەستەکردنی بڕگەو بابەتەکانی لەخۆداو تێئاڵاندنی لەژیانی ڕۆژانەدا بەتایبەتی .

ئینجا ئەگەر زانیت کە هیچ باڵەخانەیەک بەبێ دینگەو کۆڵەگە دانامەزرێ و سەقفی هیچ خانوویەک بەبێ دیوار بەرزناکرێ، بۆت ڕوون دەبێتەوە کە موسڵمانەتی هیچ کەسێکیش بەبێ پێنج پایەکانی ئیسلام دروست نابێ، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ :

(**بُني الاسلام على خمس** ....)[1].

واتە : ئایینی ئیسلام لەسەر پێنج شت دامەزراوە، هەر یەکێک لەم پێنجەش گرنگی و تایبەتی خۆی هەیە لەئیسلامدا .

١ – شایەتمان

کلیل و دەسپێک بۆ دەربڕینی ئەو باوەڕەی لەدڵدا دروست بووە و هاتنە نێو چوارچێوەی ئەم ئایینە بریتی یە لەووتنی :

((**أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله** )) .

بۆ گەورەیی ئەم شایەتمانە ئەوەندە بەسە کە خودای پەروەردگاریش ئەم شایەتیەی بۆ خۆی داوە، کە دەفەرمووێ :

{شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ

---

(١) رواه البخاري.

إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} آل عمران: ١٨

واتە : خودا شایەتی دەدات کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێک نیە بەهەق جگە لەو، مەلائیکەتەکان و خاوەن زانستەکانیش شایەتی ئەدەن،خودا دادپەروەری ڕاگرتووە هیچ پەرستراوێکی هەق و ڕاست نیە جگە لەخوا کە تواناداری کاربەجێ یە .

پاشان بۆ پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) خوای گەورە ئەم شایەتیەی داوە کە دەفەرمووێ:ـ

{مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ} الفتح: ٢٩

واتە : محمد پەیامبەری خوایە ، ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندوتیژن و لەنێوان خۆیاندا بەسۆزو بەزەیین...

٢ – ئەنجامدانی نوێژ

نوێژ کرۆکی بەندایەتی و کۆڵەکەی بەهێزو پتەوی ئایین و سیماو نیشانەی دیاری موسڵمانەتی و دوگمەی ئەمان و پارێزەری سەروماڵی خاوەنەکەیەتی ئەگەر هاتوو بەم شێوازە ئەنجامی دا کەخودا لێ ی داواکردووە، هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ : ـ

{وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ } البينە: ٥

واتە : ئەوان فەرمانیان پێ کرابوو تەنها بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن بەدڵسۆزی مل کەچی بۆبکەن لەهەموو ئاییندا کە بۆ ئەوە، خۆشیان دووربگرن لەهەموو بیروباوەڕێکی لارو پووچ، نوێژ ئەنجام بدەن و زەکات بدەن، کە ئەمەیە ئایینی ڕاستەقینە .

## پێگەی نوێژ

هەر لەبەر گرنگی و پایەی نوێژە کە لەسەر هەموو پێغەمبەران پێویستی کردووە و فەرمانیشی پێ کردوون کە بەگەورەی بزانن، هەروەکو کاتێک خوای گەورە گفتوگۆی کرد لەگەڵ موسا (سەلامی خوای لێ بێ)پێی فەرموو : {إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي} **طه**: ١٤

واتە : هەرمن ئەو خودایەم کەهیچ پەرستراوێکی هەق نیە جگە لەمن، کەواتە من بپەرستە و نوێژ ئەنجام بدە بۆئەوەی یادم بکەی .

هەروەها فەرمانی بە عیسای کوڕی مەریەم کرد (سەلامی خوای لێ بێ)کە بەخەڵکی ڕابگەیەنێ کەوا نوێژی لەسەر پێویست کراوە، هەروەکو دەفەرمووێ : { وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا } مريم: ٣١

واتە : فەرمانی پێداوم بەنوێژکردن و زەکات دان هەتا لەژیاندا بم و زیندووبم .

زیاد لەوەش، بۆ ئەم ئوممەتە گرنگی یەکەی زیاتربوو کاتێک خوای گەورە (سبحانه وتعالى)پێغەمبەری خۆشەویستمانی (ﷺ) بەرزکردەوە بۆلای خۆی تا نوێژ لەسەر ئەو و ئوممەتەکەی فەرزو پێویست بکات، هەر بۆیە سەرفرازی و ڕزگاری باوەڕدارانی بەوە بەستاوەتەوە کەخاوەن ئەم کردەوە بەرزەبن هەروەکو دەفەرمووێ :

{ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ } المؤمنون: ١ - ٢

## حوکمی نوێژ نەکەر

ئینجا ئەگەر بێینە سەر حوکمی ئەوکەسەش کە ئەنجامی نادات و وازی لێ دەهێنێ، ئەوا خەڵک لێرەدا دەبن بەسێ بەش :

١ – هەندێک باوەڕیان پێی نیە یان فەرزو پێویست بوونی بەڕەوا نازانن، ئەمانە بیکەن یان نەیکەن کافرن بە کۆڕای موسڵمانان[1] .

٢ – هەندێک دەزانن کە نوێژ فەرزو پێویست کراوە لەسەریان بەڵام لەبەر فیزو خۆ بەگەورە زانین، یان لەبەر ڕق لێ بوونەوەی لەفەرزێتی نوێژ، ئەنجامی نادات، ئەمەشیان هەر کافرە هەروەکو ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەفەرمووێ : ـ

(( **أن لايجحد وجوبها، لكنه ممتنع من التزام فعلها كبراً، أوحسداً، أو بغضاً لله ولرسوله، فيقول أعلم أن الله أوجبها على المسلمين، والرسول صادق في تبليغ القرآن، لكنه ممتنع عن التزام الفعل استكباراً أو حسداً للرسول أو عصبية لدينه، أو بغضاً لما جاء به الرسول فهذا كافر بالاتفاق** ))[2]

واتە : ئەوکەسەی دان دەنێت بەفەرزو پێویست بوونی نوێژ، بەڵام پابەندنیە بەئەنجامدانی لەبەر فیزو خۆبەزل زانینی، یان لەبەر ئیرەیی، یان لەبەر ڕق بوونەوەی لەخواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئینجا دەڵێ : دەزانم کە خودا پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕاست دەکا لەگەیاندنی قورئان، بەڵام پابەندیش نابێ بەکردنی لەبەر خۆبەگەورە زانین یان ئیرەیی بەپێغەمبەر (ﷺ) یان دەمارگیری بۆ بڕواکەی خۆی یان ڕق بوونەوەی بۆ ئەو پەیامەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، ئەمە کافرە بەکۆڕای موسڵمانان.

پاشان ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وێنەی خۆبەزل زانینی ئەم جۆرە کەسە دەچووێنێ بە فیزو خۆ بەگەورە زانینی ئیبلیس

---

(١) سەیری (المغنی) بکە (٣٥١/٣) هەروەها مجموع فتاوی (٩٦/٢٠) ..

(٢) مجموع الفتاوی (٩٧/٢٠).

(نەفرەتی خوای لێ بێ) کاتێک فەرمانی خوای جێ بەجێ نەکرد لەکڕنووش بردن بۆ ئادەم، ئەگەرچی نکوڵی لەباوەڕی خۆی نەدەکرد، هەروەها ئەبو تالبی مامی پێغەمبەر(ﷺ) کە پەیامی پێغەمبەری بەڕاست دەزانی، بەڵام لەبەر دەمارگیری بۆئایینی نەتەوەکەی و ترسی لەتانەو لۆمەی گەلەکەی، ئەوەی لەناو دڵی دابوو نەیخستە بەرگوێچکەی پێغەمبەرو(ﷺ) سەریشی نەخستە ژێر باری پەیامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) .

٣ – هەندێکیش باوەڕیان پێی هەیەو دان دەنێن بەفەرزو پێویستی ئەنجامدانی نوێژ بەڵام بەسووک سەیری دەکەن و لەشیشیان لەئاستیدا گرانە، تەمبەڵن و وادەزانن بەرزکردنەوەی شاخێکیان والەسەر شانە، ئەمانەش دەبن بەدوو بەشەوە:ـ

بەشێکیان بەتەواوەتی وازی لێ دەهێنن و لەهیچ بارو کاتێکدا ئەنجامی نادەن، ئەگەرچی زانایان لەمەدا جیاوازن چونکە هەندێکیان پێیان وایە کافر نابێت، بەڵام ڕای بەهێزو پارسەنگی قورس بەلای ئەوانە دایەو بۆئەوانەیە کە پێیان وایە ئەوکەسە کافرە، بێ گومان ئەمەش لەبەر بەهێزی بەڵگەکانیان، تەنانەت محمد بن نصر المروزی دەفەرمووێ : (**هذا مذهب جمهور أصحاب الحديث** )[1].

واتە : ئەمە ڕێڕەوی زۆرینەی زانایانی فەرموودەیە .

هەروەها ابن حزم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

(( بۆمان گێڕدراوەتەوە لە عومەری کوڕی ختاب و مەعاذی کوڕی جەبەل و ئیبن مەسعودو کۆمەڵێک لە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێ) کە نزیکەی (١٧) کەسن، هەروەها تابعین و لە ابن المبارک و احمدی کوڕی حەنبەل و اسحاق کوڕی راهویە، کەوا هەرکەسێک بە ئەنقەست نوێژی فەرز ئەنجام نەدا هەتا کاتەکەی نامینێ و لەیادیشی بێ ئەوا کافرەو هەڵگەڕاوەتەوە

---

(١) تعظيم قدر الصلاة (٦٣٦/٢).

لەئايين، هەروا عبداللە كوڕی الماحشون و عبدالملك كوڕی حبيب الاندلسی و كەسانی تريش ئەم ووتەيان فەرمووە[1] ..

بەشێكی ترهەن باوەڕيان پێی هەيەو دان بەفەرزو پێويستی نوێژ دادەنێن بەڵام جارجار لەبەر تەمبەڵی نوێژێكيان دەچێ و سوورنين لەسەر نەكردنی، ئەمانە حوكمی كوفرەكە نايانگرێتەوە [2].

---

(١) سەيری (المحلی) _٢/٣٢٦) بكە.

(٢) سەيری (نواقچ الايمان القوليه والعمليه) د . عبدالعزيز بكە : ٤٩١.

## بەڵگەکانی ئەو زانایانەی نوێژ نەکەر بەکافر دادەنێن:

١ – خودای گەورە دەفەرمووێ :ـ

**{يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ، خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ }** القلم: ٤٢ - ٤٣

واتــە : ئــەو ڕۆژەی خــوای گــەورە لاقــی پیــرۆزی دەردەخــات (باوەڕمـان پێیەتی و چۆنیەتەکەی نازانین) وە بانگ دەکرێن بۆ سوژدە بردن، بەڵام ناتوانن، چاویان شۆڕەو ڕیسوایی دایان دەگرێ .

ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

خـوای گـەورە بـاس و وەسـفی بـێ باوەڕەکـانی کـردووە بـە سـووژدە نەبردن[1].

لەفەرموودەشـدا هـاتووە کـە لـەم ڕۆژەداو لـەم کاتـەدا بـاوەڕداران هەموویان کڕنووش دەبەن، تەنها بێ باوەڕان و دووڕووەکان نەبێ کـە بـۆ ڕووپامایی (ریـاء) نوێـژیان دەکـرد ، ئەمانـە پشـتیان وەکـو قۆچـی مانگا ڕەق دەبێت و ناتوانن بۆ سوژدە بردن بچن .

٢ – خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

**{كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ، إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ، فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ، عَنِ الْمُجْرِمِينَ، مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ، قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ }المدثر:** ٣٨ – ٤٣

واتەـ هەموو کەسێک بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی، مەگـەر ئەوانــە نــەبێ کــە پــەڕاوی کردەوەکانیــان بەدەســتی ڕاســت وەرئەگرنــەوە، لـەناو باخچـەکانی بەهەشـتدا پرسـیار لەیـەکتری ئەکەن، لەحاڵی تاوان باران، ئایا چی ئێوەی خستووەتە دۆزەخـەوە ؟ ئەوانیش دەڵێن : ئێمە نوێژمان نەدەکردو لەنوێژخوێنان نەبووین.

---

(١) مجموع الفتاوى (٧ / ٦١١).

ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ خوای گەورە تاوان بارانی لەدژی موسڵمانان هەژمارکردووە، ئەوکەسەش کە نوێژ ناکات لەگەڵ ئەو تاوانبارانەیە کە دەچنە ناو ئاگری سەقەر، وەک دەفەرمووێ :ـ {**إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ، يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ**} القمر: ٤٧ – ٤٨[1].

٣ – خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{**فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا**}مریم: ٥٩

واتـە/ ئینجا لەپاش ئەوان کەسانێک بەشوێنیان هاتن کە نوێژیان دەفەوتاندو شوێن هەواو ئارەزووەکان کەوتن، جا ئەمانە لەداهاتوودا تووشی سزای دۆزەخ دەبن .

لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئیمامی ئەوزاعی لە موسای کوڕی سلیمان لە قاسمی کوڕی مخیمرە گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی : (**إنما أضاعوا المواقيت ولوكان تركاً لكان كفراً**)[2]

واتـە/ بێ گومان کاتی نوێژەکانیان فەوتاندووە، ئەگەر نوێژەکانیان فەوتاندایەو وازیان لێ بهێنایە ئەوا کارەکەیان دەبوو بە کوفر .

٤ – خودای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ**}المنافقون: ٩

واتـە/ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و منداڵەکانتان بێ ئاگاتان نەکەن لەیادی خوا، هەرکەسێکیش وابکات ئەوا خۆیان زەرەرمەندن .

ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

---

(١) كتاب الصلاة : ٣٨.

(٢) تفسير ابن كثير (١١٥/٣) ..



**(ووجه الاستدلال بالآية أن الله حكم بالخسران المطلق لمن ألهاه ماله وولده عن الصلاة، والخسران المطلق لايحصل إلّا للكفار)**[1]

واتە : شێوەی بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە ئەوەیە کە خوای گەورە بڕیاری زەرەرمەندی تەواوی داوە بۆ ئەوکەسەی ماڵ و منداڵی بێ ئاگای دەکات لەنوێژ، زەرەرمەندی تەواویش تەنها دەرهەق بەبێ باوەڕانە .

٥ – خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

**{فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ }** التوبە: ١١

واتە :ـ ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان ئەنجام داو زەکاتیاندا ئەوا براتانن لەئاییندا.

محمد المختار **الشنقيطي** دەفەرمووێ :ـ (ئەوەی لە ئایەتەکەدا دەناسرێتەوە ئەوەیە کە ئەوان ئەگەر نوێژیان ئەنجام نەدا نابن بەبرای باوەڕداران، کەسێکیش برایەتی بۆ باوەڕداران نەما، کەواتە چۆتە ڕیزی بێ باوەڕان چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: **{إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ }** الحجرات: ١٠

جابرایەتی ئایینی بە گوناهەکان لاناچێ هەرچەند گوناهەکان گەورەبن، بەڵکو بەدەرچوون لەئیسلام نامینێ)[2] . .

٦ – خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا إِنَّكُمْ مُجْرِمُونَ ، وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ، وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ ، وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ } المرسلات: ٤٦ – ٤٩

واتە : ـ بخۆن و ڕابوێرن کەمێک لەدونیادا، بەڕاستی ئێوە تاوانبارن، سزاو نەهامەتی لەو ڕۆژەدا بۆ بێ باوەڕان، کاتێک پێیان

---

(١) **كتاب الصلاة** : ٤٢.

(٢) **سە یری اضواء البيان بكە** (٣١١/٤).

بووترێ : کڕنۆش بەرن بۆ خوا، کڕنۆش نابەن، سزاو نەهامەتی بۆیان لەوڕۆژدا.

ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :ـ

(( **توعدهم على ترك الركوع، وهو الصلاة إذا دعوا إليها، ولا يقال إنما**

**توعدهم على التكذيب، فإنه سبحانه وتعالى إنما أخبرهم عن تركهم لها، وعليه وقع الوعيد**)) (١)

واتە : هەڕەشەی سزای لێ کردوون لەسەر کڕنۆش نەبردنیان، کە بریتیە لەو نوێژەی بانگ دەکرێن بۆی، وەنابێ بووترێ کە هەڕەشەی لێ کردوون لەسەر بەدرۆ خستنەوەیان، چونکە خوای گەورە هەواڵی کڕنۆش نەبردنیانی پێداون هەربۆیە سزایەکەشی خستۆتە سەر نەکردنەکەیان .

٧ – خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ} الروم: ٣١

واتە : نوێژ ئەنجام بدەن و لەهاوبەش دانەران مەبن .

(لەمەشدا خودای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە لەنیشانەکانی موشریکەکان وازهێنانە لەبەجێ هێنانی نوێژ) (٢)

٨ – خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ} **البقرة**: ١٤٣

واتە : هەرگیز خوای گەورە بڕواتانی (نوێژەکانتانی) نەفەوتاندووە.

شیخ عبدالرحمن السعدی لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ :ـ

(**وفي هذه الآية دليل لمذهب أهل السنة والجماعة أن الإيمان تدخل فيه اعمال الجوارح**) (٣)

---

(١) كتاب الصلاة : ٤٢.

(٢) تعظيم قدر الصلاة (٢/١٠٠٥ – ١٠٠٦) ..

(٣) **تيسير الكريم الرحمن** –٧١.

واتە : لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە بۆ بۆچوون و بڕوای ئەهلی سوننەو جەماعە کەوا باوەڕ کردەوەی ئەندامەکانی لەشیش دەگرێتەوە.

جا ئەگەر ئەنجامدانی ئەم کردەوەیە باوەڕبێت، بەپێچەوانەوە وازهێنانیشی کوفرە .

٩ – پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ : ـ

(**بين العبد وبين الكفر والإيمان الصلاة، فإذا تركها فقد أشرك**) [١]

واتە : لەنێوان بەندەو نێوان کفرو باوەڕ نوێژە، جا ئەگەر وازی لێ هێنا ئەوا هاوبەشی بۆخوا بڕیارداوە.

بێ گومان ئەو هاوبەشەی خوا زۆرجار خودی نەفسی نوێژنەکەرەکەیە چونکە لەوکاتەی پێویستە لەسەری بەندایەتی و مل کەچی خۆی بۆخودا بنوێنێ کە داوای لێ دەکات کڕنۆش بەرێت و نوێژبکات، نەفسی بەدکاری فەرمانی پێ دەکات بەکڕنۆش نەبردن و نوێژەکە نەکات، دواجار گوێڕایەڵی خاڵی یەکلاکەرەوەیە لەبوونی بەبەندەی کام لا، ئەگەر کڕنۆشی نەبردو گوێڕایەڵی نەفسی کرد ئەوا دەبێتە بەندەی نەفسی خۆی، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ:

{**أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا** }الفرقان: ٤٣

واتە: ئایا بینیوتە ئەوکەسەی هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی، ئایا تۆ پارێزەری بۆئەو تا شوێنی ئارەزووی نەکەویت؟

ابن **كثير** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : ـ

(**مهما استحسن من شيئ ورآه حسناً في هوى نفسه كان دينه ومذهبه**) [١]

---

(١) **أخرجه اللالكائي وقال اسناده صحيح على شرط مسلم وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب** (١/٢٢٧)..



واتە : هەرشتێکی پێ چاک بێ و بەپێی ئارەزووی نەفسی خۆی بەچاکی ببینێ ئەوا دەبێتە ئایین و پەیرەوی .

١٠ - پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ : ـ

(**العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر**) (٢)

واتە: ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمەو ئەواندا (کافرەکان) هەیە، نوێژە، جا هەرکەسێک وازی لێ بهێنێت ئەوا بێ باوەڕبووە .

(( کاتێ ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) بریندار کرابوو، لەهۆش خۆی چووبوو، بەیانی ووتیان : نوێژە ، فەرمووی : بەڵێ (**لاحظ في الاسلام لمن ترك الصلاة**)) (٣).

واتە : لەناو ئیسلامدا هیچ بەشێک نیە بۆ ئەوکەسەی وازی لەنوێژ هێناوە.

تابعی بەڕێز عبداللّه کوڕی شقیق العقیلی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : (**کان اصحاب رسول (ﷺ)لایرون شیئاً من الاعمال ترکه کفر غیر الصلاة**) (٤).

واتە : هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێیان وابوو هیچ شتێک لەکردەوەکان وازهێنانی کوفرنیە، تەنها نوێژ نەبێ .

بێ گومان بەڵگەکان زیاترن، بەڵام ئەوەی باسمان کرد بەسن بۆکەسێ ڕاستی و ڕاجحی مەبەست بێ نەک پەستی و بیانوو. دواجار ووتەی إسحاق کوڕی راهویە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)دەهێنینەوە کە دەفەرمووێ : ـ

(**قد صحَّ عن رسول الله (ﷺ)أن تارك الصلاة عمداً كافر، وكذلك كان رأي أهل العلم من لدن النبي (ﷺ)إلى يومنا هذا أن تارك الصلاة عمداً من غير عذر حتى يذهب وقتها كافر**) (٥)

---

(١) تفسير ابن كثير (٣/٢٨٣).

(٢) أخرجه احمد والترمذي وصححه الالباني.

(٣) كتاب الصلاة —: ٥٠.

(٤) أخرجه الترمذي وصححه الالباني.

(٥) تعظيم قدر الصلاة (٢/٩٣٠) ..

واتە : فەرموودەی دروست لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)هاتووە کەوا نوێژنەکەری بەئەنقەست کافرە، هەروەها ڕای زانایان لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)تا ئەمڕۆمان ئەوەیە کەوا کەسێ نوێژ نەکات بەئەنقەست بەبێ هیچ بیانوو تا کاتەکەی دەڕوا کافرە .

هەروەها بەپێی فەرموودەی (**لتنتقض عرا الاسلام عروة عروة........وأخرهُن الصلاة**) بێت نوێژ دواگرێ و قولفەیە، ئایا کەسێ دەستی لەویش بەربێت چی بەسەردێت ؟

٣ – زەکات

ئەگەر نوێژ ماف و هەقێکی خوایە لەسەر بەندەکان، ئەوا زەکاتیش ماف و هەقێکی هەژارو نەدارانە لەسەر خواپێداوو دەوڵەمەندەکان، جا چۆن بەنەکردنی نوێژ پەیوەندی بەندە بەخواکەی نامینێ و تێک دەچێ، بەنەدانی زەکاتیش پەیوەندی کۆمەڵایەتی (سۆزوبەزەیی، برایەتی و خۆشەویستی، هەست کردن بەناخۆشی و پێویستی یەکتری) نێوان بەندەکانیش نامینێ و تێک دەچێ هەربۆیە خوای گەورە هەردووکیانی بەیەکتری بەستاوەتەوەو لەزۆربەی ئایەتە پیرۆزەکاندا ئەگەر باسی یەکێکیان کرابێ، ئاماژە بەئەوەی تریشیان کراوە، نموونەی ئەم قسەیەش لەقورئاندا زۆرە، هەروەکو دەفەرمووێ :ـ

{**وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ**}**البقرة**: ١١٠

هەروەها دەفەرمووێ :ـ

{**فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ** } التوبه: ٥

واتە : ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە پەشیمان بوونەوەو باوەڕیان هێنا و نوێژیان بەجێ هێناو زەکاتیان دا، ئەوا ئازادیان بکەن .

٤ – ڕۆژوگرتن

گرنگی ئەم ڕوکنەش لەوەدایە کەیارمەتی باوەڕداران دەدات دەسەڵاتیان بخەنەوە سەر ئەو نەفسە سەرکەش و ئارەزووبازەی کەهەرجارەی پێی بڵێی تێربووی ؟ پێت دەڵێ : هیچی تر هەیە ؟

بۆیە دەبێ جڵەوگیر بکرێ بەو هۆکارانەی دەبنە مایەی پاراستنی لەسەرپێچی و سەرکەشی، کە بێ گومان ڕۆژووش یەکێکە لەو هۆکارانە هەروەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێ :ـ

{**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ** }**البقرة**: ١٨٣

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نوسراوەو پێویست کراوە هەروەکو لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە نوسراوو پێویست کرابوو، تاکو لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەسەرپێچی کردنی .

٥ – حەج کردن

حەج کردنی ماڵی خوا، بەجێ هێنانی ماف و هەقێکی خوایە لەسەر بەندەکانی کە لەلای ئەوماڵەی خودا فەرمانی بە ابراهیم کرد (سەلامی خوای لێ بێ) پاکی بکاتەوە لەبت پەرستی (**وَطَهِّر بَيْتِيَ**) قتادەو مجاهد دەفەرموون((واتە لەشیرک، پاک بکرێتەوە {**لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ**}**الحج : ٢٦**

بۆ ئەوبەندانەی دێن و بەدەوری دا تەواف دەکەن کە ئەویش خواپەرستیەکە تەنها لەماڵی خوداو بەدەوری ماڵی خوادا دەکرێت))[1].

ئینجا وەڵامدانەوەی بانگەوازی خوایە، کە لەسەر زاری ابراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) ڕادێرا بۆ هەموو خەڵکی، لەوکاتەوە تا ڕۆژی دوایی، هەروەکو خوا دەفەرمووێ :ـ

{**وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ** }الحج: ٢٧

---

(١) تفسير ابن كثير (١٩٢/٣).

واتە: ـ بانگ بدە بەناو خەڵکیدا بۆ حەج کردن، دێن بۆ لات بەپیادەو بەسواری هەموو ووشترێک، لەهەموو ڕێگایەکی دوورەوە دێن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

(**مَن حَجَ فلم يرفث ولم يفسق رجع كيوم ولدته أمُهُ**)[1].

واتە : هەرکەسێک حەج بکات و قسەی خراپ و تاوان نەکات دەگەڕێتەوە وەک ئەو ڕۆژەی لەدایک بووە .

هەروەها دەفەرمووێ :ـ

(**الحَجُ المبرور ليس له جزاءٌ إلا الجنة**)[2].

واتە : حەجێکی پاک و دروست و لەلای خواوە وەرگیراو پاداشتی نیە بەهەشت نەبێت .

---

(١) متفق عليه.

(٢) متفق عليه.

## پایەی باوەڕو ڕوکنەکان

باوەڕ پلەو پایەو لق و پۆپی هەیە، بەخواپەرستی و چاکەکردن زیاد دەکات و خاوەنەکەی بەرزدەکاتەوە تا پلەی ڕاستگۆیان (صدیقین) و پیاوچاکان و لەخوا نزیکان، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی شوێن و مەنزڵگای بۆ پلە بەرزەکانی بەهەشت، هەروا بەتاوان و سەرپێچی کردنی خوا کەم دەکات و لاواز دەبێ تا دەگاتە ئاستێک کە تەنها ئەسڵی باوەڕەکەی دەمێنێ کە بەهۆیەوە لەئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوەو تا هەتایی تێیدا نامێنێتەوە.

بەڵام لەمە کەمتر خاوەنەکەی مەترسی گەورەی لێ دەکرێ ئەویش نەمانی باوەڕەکەیەتی بەیەکجاری (بە ئەنجامدانی گوفتار یان کردارێکی کوفری) .

کەواتە ئەوباوەڕە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەموسڵمانەتی و گوێڕایەڵی، هەربۆیە زۆرێک لەزانایان پێیان وایە باوەڕو ئیسلام یەک شتن لەوانەش ئیمامی بوخاری و ابن حبان لەزانایانی فەرمووده، هەروەها لەزانایانی فقهی ئیسلامیش هاوەڵانی شافعی و مالکی، هەروەکو **الحافظ** ابن عبدالبر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ[1]: -

((ئەوەی ڕای کۆمەڵی فیقهی ئیسلامی لەسەرە ئەوەیە کە باوەڕو ئیسلام یەکن بەبەڵگەی ئەوەی باسکراوە لەقورئانی پیرۆز وەکو ئایەتی: -

{فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ }**الذاريات**: ٣٥ – ٣٦

وە محمد بن نصر المروزی بەدرێژی باسی ئەم بابەتەو ئەو بەڵگانەی لەسەر هاتووە لەئایەتە پیرۆزەکانی قورئان کردووە[2].

---

(١) التمهيد لابن عبدالبر (٩/٢٥٠).

(٢) تعظيم قدر الصلاة لمحمد نصر المروزي

سەبارەت بە لقەکانی باوەڕ کە ئاسۆیەکی فراوانتر لەخۆ دەگرێ لەگوفتارو کردارو ئاکاری موسڵمانەتی، دیسان ئاماژەیە بۆئەوەی باوەڕ هەرتایبەت نیە بە بڕواو کرداری دڵ بەڵکو کردەوەی ئەندامەکانیش دەگرێتەوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :-

(**الإيمان بضع وسبعون شعبة، فأعلاها قول (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان**)[1].

واتە : باوەڕ حەفتاو ئەوەندە لقە، جا بەرزترینی ووتنی : (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**)یە، نزمترینی لادانی زەرەرێکە لەسەر ڕێگا، شەرمیش لقێکە لەباوەڕ.

١ - باوەڕ بەخوای گەورە (الإیمان باللّه)

لەدوای ناسین و دروست بوونی باوەڕی دڵ بەخوای تاک و تەنها، پێویستە گەورەیی و شکۆمەندی بۆ خودا بڕیاربدرێ، هەروەکو ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)لەباسی پایەی بەگەورەزانین دا دەفەرمووێ :- (**على قدر المعرفة يكون تعظيم الرب تعالى في القلب، وأعرف الناس به، أشدهم له تعظيماً وإجلالاً.**)[2] .

واتە : بەئەندازەی ناسینی خوا، بە گەورە زانینی خوای گەورە لەدڵدا دەبێ، ئەوکەسەش کە لەهەموو خەڵکی شارەزاترە بەخوا؛ لەهەموویان زیاتر خودا بە گەورە دادەنێ و شکۆمەندی بۆ بڕیار دەدا.

لەوەشدا دەبێ پەرتووکی خواو پەیام و پێغەمبەرانیشی بەرێزو گەورە بزانرێ، ئینجا هەموو کارێکی پەرستشی بەتەنها بۆ ئەنجام بدرێ، بە ئەوپەڕی خۆشەویستی و مل کەچی .

هەروەها ڕق لێ بوونەوەو دوورکەوتنەوە لەهەموو ئەوشتانەی لەلای خودا خراپن و پێی ڕازی نیە، وەک شیرک و کوفرو تاوان و

---

(١) رواه مسلم وابو داود والنسائي وابن ماجه.

(٢) مدارج السالكين (٢/٤٩٥).

ستەم و سەرپێچی، هەروا ئەوانەش کەپەیرەوی شیرک و کوفرو ستەم دەکەن .

## ٢ – باوەڕ بەمەلائیکەتەکان (**الإيمان بالملائكة**)

باوەڕ بوون بە مەلائیکەتەکان دەچێتە چوارچێوەی باوەڕبوون بە غەیب و شتە پەنهانەکان کە لەگرنگترین سیفەت و ئاکاری باوەڕدارانە، کەپێیەوە لەبێ باوەڕان جیا دەکرێنەوە چونکە بێ باوەڕان تەنها باوەڕیان بەوشتانە هەیە کە بەچاوی کورت بینیان دەیبینن و بەبیری بێ نوریان هەستی پێ دەکەن، بەڵام باوەڕداران تەنها بە هەواڵدانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ)لەلایەن خواوە، باوەڕیان هەیە کە سەربازی خوان، لەنور دروستی کردوون، جۆراوجۆرن، گەورەیان (جبریل)ە (سەلامی خوای لێ بێ)کە گەیاندنی پەیام و سروشی خوا بەپێغەمبەرانی پێ سپێردراوە، هەروا خودا لەزۆر شوێن لەقورئانی پیرۆز باسی کردووە کەوا سپاردە پارێز (أمین)ە هەروەکو دەفەرمووێ:-

{**نَـزلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ**} الشعراء: ١٩٣

هەروا زۆر بەهێزو بەتوانایە، وەک خودا لەبارەیەوە دەفەرمووێ :-

{**عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى**}النجم: ٥

ئینجا خاوەن ئاکارو شێوەیەکی جوانە :

{**ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى**}النجم: ٦

هەروەها (میکائیل) کە گەورەی ئەو مەلائیکەتانەیە کەکاروباری هەوروبارانیان پێ سپێردراوە کە سەرچاوەی ڕزق و ڕۆزی خەڵک و گیانلەبەرانە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

{أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ} **السجدة**: ٢٧

هەروەها (إسرافیل) کە ئەرکی فووکردن بەو کەڕەنایەی پێ سپێردراوە کەڕۆژی دوایی پێ دەقەومێ، پاشان جارێکی تر فووی پێدا

دەکات و خەڵک هەموویان لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ، هەروەکو گژوگیاو دانەوێڵە کە لەزەوی دێتە دەرێ.

**{وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ}** الزمر: ٦٨

هەروەها مەلائیکەی تریش کە هەرخوا خۆی دەزانێ ژمارەیان چەندە.

٣ – باوەڕ بە پەرتووکە ئاسمانیەکان (**الإيمان بالكتب المُنَزلة**)

ئەمەش پایەکی گرنگی باوەڕە، لەوەدا کەدەبێ بڕوامان وابێ خودای زانای شارەزا ژیان و گوزەرانی ئەم ئادەمیزادەی بەبێ یاساو دەستوور بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو بۆ چۆنیەتی ئەنجام دانی پەرستنی خوا، وە چۆنیەتی گوزەران و مامەڵەکردن لەگەڵ بەندەکانی خوا، چەندین پەیام و بەرنامەی دابەزاندووە بۆ ڕێنموویی و بەرچاو ڕوونی بەندەکانی، بۆیە دەبێ باوەڕدار بڕوای بەهەموو پەرتووکەکانی خوا هەبێ، وەک دەفەرمووێ:-

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا}** النساء: ١٣٦

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، باوەڕ بهێنن بەخواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)ئەو قورئانەش کە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرەکەی و ئەو پەرتووکانەش کە لەپێشتر دابەزیوە، هەرکەسێکیش بێ باوەڕبێت بەخواو مەلائیکەتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی ئەوا بەڕاستی گومڕا بووە و سەرگەردان بووە بە گومڕایی یەکی دوور.

٤ – باوەڕ بە پێغەمبەران (**الإيمان بالرسل** (**عليهم السلام**))

پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) ئادەمیزادن، لەلایەن خوداوە هەڵبژێردراون بۆ گەیاندنی پەیام و پەرتووکی خوا بە بەندەکانی خوا بەگشتی بەمەبەستی ڕزگارکردنی گەل و نەتەوەکان لەشیرک و گومڕایی و خراپەکاری و تاوان، وە بۆ تەنها

خواپەرستی و بەرچاو ڕوونی و چاکەو ئاکاری جوان، لەوەشدا مژدەدەربوون بە ڕەزامەندی و بەهەشتی خوا بۆ ئەوکەسانەی باوەڕیان پێ دەکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان دەبن، ترسێنەریش بوون بەسزاو تۆڵەی خودا بۆ کەسانێک کە بەدرۆیان دەخەنەوەو پشتیان لێ دەکەن هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

{**كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ، وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ، فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ**}**البقرة**: ٢١٣

ئینجا باوەڕداران هەروەکو لەدونیا باوەڕیان هەبووە بە پێغەمبەران، لەدوا ڕۆژیشدا ئەم شایەتیە دەدەنەوەو دەڵێن{ **لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ**}الأعراف: ٤٣

٥ – باوەڕ بە ڕۆژی دوایی (**الإيمان باليوم الآخر**)

گرنگی ئەم پایەش لەباوەڕدا زۆر گەورەیە، چونکە خودای گەورە باوەڕ هەبوون بە زاتی پاکی بەستاوەتەوە بە باوەڕهەبوون بەم ڕۆژە کە بریتیە لەوەی بڕوایەکی تەواوت هەبێ بەڕوودان و هاتنەکایەی ئەم ڕۆژە، باوەڕێک وات لێبکات کاری بۆ بکەی و توێشووی پێویستی بۆ ئامادەبکەی، باوەڕت بەم ڕوکنە هەبێ هەر لەوکاتەی گیان لەلاشە دەردەچێ تا ئەو ڕۆژەی باوەڕداران بەرەو بەهەشت بەرێ دەکرێن و بێ باوەڕانیش بۆ دۆزەخ ڕادەکێشرێن{ **يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا، وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا**}مريم: ٨٥ - ٨٦

هەر باوەڕداران باوەڕیان وایە کە کاتی ڕوودان و هاتنی ئەم ڕۆژە لەلای خودایەو هیچ پێغەمبەرێکی نێردراوو هیچ مەلائیکەیەکی نزیک کراو زانیاری نیە لەسەر کاتی هاتنی، بەڵام نیشانەو پێشەکی هەیە بەڵگەن لەسەر نزیکی هاتنی ئەم ڕۆژە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

{يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا} الأحزاب: ٦٣

واتە :ـ ئەی محمد (ﷺ)خەڵک پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕوودان و هاتنی ڕۆژی دوایی، بڵێ زانستی ئەو ڕۆژە لای خودایە، تۆ چوزانیت لەوانەیە هاتنی ڕۆژی دوایی نزیک بێت.

هەروەها دەربارەی نیشانەکانی دەفەرمووێ :ـ

{**فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا**} محمد: ١٨

واتە :ـ ئایا ئەمانە چاوەڕوانی چی دەکەن، جگە لەڕۆژی دوایی کە کت و پڕ تووشیان بێت، بێ گومان نیشانەکانی هاتۆتە دی .

ئینجا لەسۆنگەی باوەڕ هەبوون بەم ڕۆژە دەبێ باوەڕدار ترس هاودەمی بێت لەناخۆشی و ڕووداوەکانی ئەم ڕۆژە تا ئەم ترسە دەبێتە هۆکارێکی بەهێز بۆ کارکردن بەهەردوو جەمسەری ئەنجامدانی چاکەو خۆپاریزی لەتاوان و خراپە .

٦ – باوەڕ بە قەزاو قەدەر (**الإيمان بالقضاء والقدر**)

لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەم ئادەمیزادە لەسەر ئەم زەوی یە لەهەندێک شتدا هیچ بەدەستی ئەونیە و لەتواناو ویستی ئەو بەدەرە واتە (مُسێر)ە، وەک دروست کردنی لەپشتی باوکی پاشان لەنێو ڕەحمی دایکی، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{**وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ**}الأنعام: ٩٨

واتە : ئەو خودایە ئێوەی دروست کردووە لەیەک کەس (کە ئادەمە (سەلامی خوای لێ بێ))ئینجا (لەپشتی باوکتان)نیشتەجێ کران دواتر (لەڕەحمی دایکتان) دانران بەشێوەیەکی کاتی .

هەروەها لەو چوارشتەش کە لەناو ڕەحمی دایک دا بۆی دەنوسرێ و دەبڕێتەوە، هیچیان ئادەمیزاد تێیدا خاوەن ویست و ئارەزوو توانا نیە، کە بریتین لەنووسینی : کاتی مردنی (أجلە)و کردەوەکەی و

بەشە ڕۆزیەکەی و سەرەنجامی(کە ئایا بەختەوەرە یان بەد ئاکام)

.

هەروەها لەو بەڵاو ناخۆشیانەی دێتەسەری بەمەبەستی تاقی کردنەوەی، ئینجا لەمانەدا باوەڕدار دەبێ وێڕای باوەڕی دەبێ مل کەچی و ڕەزامەندی دەرببڕێ بەرامبەر بە قەزاو قەدەرەکانی خوا، چونکە خوای گەورە {**لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ**}الأنبياء: ٢٣

پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی دەیکا، بەڵکو ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ لەوەی ئەنجامی دەدەن.

لەگەڵ ئەمەشدا مرۆڤ لەهەندێک شتی تردا ویست و هەڵبژاردن و توانای هەیەو پێی بەخشرایەو زۆرلێکراو (مجبر)نیە، هەروەکو دەفەرمووێ :-

{**لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ، كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ**

}

**المدثر**: ٣٧ - ٣٨

واتە : بۆ هەرکەسێک لەئێوە کە دەیەوێ و ویستی وایە پێش بکەوێت لەچاکە یا دوابکەوێت، هەمووکەسێک بارمتەی کردەوەی خۆیەتی.

بەڵام هەموو ویست و تواناو کردەوەکانیشی هەر لەژێر ویستی خوادایە، هەروەکو دەفەرمووێ: {**وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ**} التكوير: ٢٩

واتە : ویستتان بۆ هەرشتێک بێ نابێ تا ویستی پەروەردگاری جیهانیانی لەسەر نەبێ.

هەروا خودا دروستکاری کردەوەکانی ئادەمیزادە لەڕووی زانین و بڕیارو چەندێتی و چۆنیەتی و ئەندازەگیریەکەی، بەڵام مرۆڤەکان بکەری کردەوەکانی خۆیانن بەو مانایەی ئەنجام دان و بەدەست هێنانەکە (**فعل وكسب**) لەلایەن بەندەکانە، هەروەکو دەفەرمووێ :- {**وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ**}الصافات: ٩٦

واتە : خودا ئێوەی دروستکردووە هەروا ئەوەش کە دەیکەن .

ئینجا تەواوی باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر لەوەدایە کە باوەڕت بە هەرچوار پایەکانی هەبێت کە بریتین لە :-

١ – زانست و زانیاری خوای گەورە بە هەموو دروستکراوەکان و ڕووداوەکان ئەزەلیە، هەروەک خودی خۆی و ناووسیفاتەکانی .

٢ – نووسینی هەموو شتێک لە (**لوح المحفوظ**) دا، لەژیانی دونیاو سەرەنجامی هەموو ئادەمیەکان و چوونیان بۆ بەهەشت یان دۆزەخ[*].

٣ – ئینجا هەرچی دەبێ و ڕوودەدا هەر بەپێی ویست و خواستی خودا ڕوودەدات و کۆک و ڕێک بەپێی زانستی نوسراوی خوایە لە (**لوح المحفوظ**).

٤ –هەرچی هەبووەو هەیەو لەمەودوا دروست دەبێ هەمووی خودای گەورە دروستی کردووە، کردگارە بۆئەوەی ویستی لەسەرە {**إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ**}هود: ١٠٧

هەروەها دەفەرمووێ :{ **إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ**}القمر: ٤٩

واتە : بێگومان هەموو شتێکمان بەئەندازەی پێویست دروست کردووە.

{**وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا**}الفرقان: ٢

واتە : هەموو شتێکی دروست کردووە و ئەندازەیەکی دروست و بێ کەم و کوڕی بۆ دارشتووە .

هەروەها دەفەرمووێ :-

{**سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا**}الأحزاب: ٣٨

واتە: بڕیارو فەرمانی خودایە کە جێ بەجێ بووە بەسەر ئەوانەی لەپێشدا ڕۆیشتوون، کاروبڕیاری خوداش دانراوە بە ئەندازەیەکی ووردو دروست .

---

(*) هەروەک لە فەرموودەدا هاتووە کە ئەم زانستەی نووسیوە پێش دروستکردنی بوونەوەر بە (٥٠) هەزار ساڵ

((ئینجا ئەهلی سوننەو جەماعە بڕوای پتەویان بەوەیە کە هەموو چاکەو خراپەیەک بە بڕیارو دانانی (**قضاء وقدر**) خودای گەورە دەبێ، خوداش کردگارە بۆئەوەی ویستی لەسەرەو دەیەوێ بیکات، چونکە هەموو شتێک بەویستی ئەوەو لەبەرنامەڕێژی ئەو دەرناچێ، هەرچی بووەو دەبێ لەشتەکان و ڕووداوەکان پێش ڕوودانیان زانراوە لەلای پەروەردگار، ئەندازەو چۆنیەتی بۆ سازکردووە بەهۆی زانستی پێش وەختەی بەشتەکان، بەگوێرەی ئەو شێوە گونجاوەی بۆی دانراوە لەحیکمەتی خودا، ئینجا خودا هەموو قۆناغەکانی ژیانی بەندەکانی زانیوەو زانستی تەواوی هەیە لەسەر ڕزق و ڕۆزی و تەمەن و کردەوەکانیان و هەموو شتێکی تریش لەکاروبارەکانیان)) [١].

دوای پایەی ئیسلام و باوەڕ، پایەی سێ یەم دێت کە چاکەکاری یە (الإحسان) ئەویش لەلایەن چاکترین کەس پێناس کراوە کە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)دەفەرمووێ :-

(**...أن تعبدالله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك**) [٢]

واتە : ئەوەیە کە خودای گەورە بپەرستی بەشێوازێکی ڕێک و دروستی وا کە هەروەکو ئەوەی بیبینی، خۆ ئەگەر تۆش ئەوت نەبینی ئەوا بەردەوام هەست بکەی بەچاودێری خودا چونکە ئەو تۆ دەبینی.

خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێ :-

{**إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ**}النحل: ١٢٨

واتە : بێ گومان خودا لەگەڵ ئەوکەسانەیە کە خۆپارێزن لەگوناهو لەهەمان کاتیشدا چاکەکارن.

---

(١) **كتاب الايمان للأثري**: ٥٧ – ٥٨.

(٢) رواه مسلم..

## پلەو پایەی جیهادکردن لەڕێگای خودا (عزوجل)

جیهادکرن لەڕێگای خودا یەکێکە لەو دەرگایانەی کە ئەگەر باوەڕدار بیەوێ بیکاتەوەو بچێتە نێو باسەکەی، ئەوا پێویستی بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر دەبێ تا دەیکاتەوە، چ جای ئەوەی کەسێک بیەوێ چەمک و مانای ئەم ووشەیە بخاتە نێو پەڕەکانی ڕۆژگاری تەمەنی و بیکا بەکردەوە !!

ئینجا داخستنی دەرگای ئەم باسەش ئەستەمە، لەبەر گرنگی و پێگەی ئەم فەریزەیە لە دەقەکانی قورئان و فەرموودە لەلایەک و سووری پەڕەکانی مێژووی ئیسلامی بەگیان فیدایی و کۆشش و لێبڕانی پێغەمبەری موجاهیدو (ﷺ)پیاوچاکانی سەلەف و خەلەف و ئێستاش، ئەم کاروانە پیرۆزەش تا ڕۆژی دوایی بەردەوامەو پیاوو سوارچاکی خۆی بۆ دروست دەبێ لەلایەن خودای کردگارەوە، هەروەکو **الحافظ** ابن حجر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەڕاقەی فەرموودەی : (**الخيل معقودٌ بنواصيها الخير إلى يوم القيامة، الأجر والمغنم**) دەفەرمووێ : ((**وفيه بُشرى ببقاء الاسلام وأهله الى يوم القيامة، لأن من لازم بقاء الجهاد بَقاءُ المجاهدين وهم المسلمون**)) ..[1]

واتە : لێرەشدا مژدە بەمانەوەی ئیسلام و موسڵمانانی تێدایە تاڕۆژی دوایی چونکە پێویستی مانەوەی جیهاد بەستراوە بەبوونی موجاهیدان و ئەوانیش موسڵمانانن.

جیهادیش لەپێناو بەرزترین و پاک و بەنرخ ترین مەبەست دانراوە کە ئەویش چەسپاندن و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی تەنها خوا پەرستی یە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ {**وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ**} الأنفال: ٣٩

واتە : بجەنگن لەدژیان تاوەکو شیرک و هاوەڵ دانان بۆخودا نەمێنێ و ئایین هەمووی بۆ خودا بڕیار دەدرێ .

---

(١) فتح الباری شرح صحيح البخاری.

عبدالرحمن کوڕی زەید کوڕی أسلم دەفەرمووێ (**وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ**) واتە : تاوەکو لەگەڵ ئاییینتاندا بێ باوەڕی نەبێ[١].

پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

(**بُعِثْتُ بالسيف بَينَ يَدَيْ السَّاعَةِحتى يُعبدَ اللهُ وحدَه لا شريك له، وَجُعِلَ رِزْقِي تَحتَ ظِلِّ رُمْحِي، وَجُعِلَ الذِّلَّةُ وَالصَّغَارُ علَى مَنْ خَالَفَ أمْرِي، وَمَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَمنهم**..) [٢]

واتە : بەشمشێر ڕەوانەکراوم لەبەردەم هاتنی ڕۆژی دوایی تاوەکو خودا بەتەنها بپەرسترێ کەهیچ هاوەڵ و هاوتای نیە، وە ڕزق و ڕۆزیم خراوەتە ژێر سێبەری ڕمەکەم، سەرشۆڕی و بچووکی خراوەتەسەر ئەوکەسەی سەرپێچی فەرمانەکانم دەکات، هەرکەسێک خۆی بچووێنێ بەگەل و نەتەوەیەک و لاساییان بکاتەوە ئەوا لەوانە .

جیهادکردنیش بەمانا سەرەکی یەکەی خۆی کە جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەیە بەرامبەر بێ باوەڕان(القتال) فەرزو پێویست نەکرا لەسەر موسڵمانان هەتا کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە، ((چونکە لە مەککە فەرمانیان پێ کرابوو ئارام بگرن بەرامبەر ئەشکەنجەو ئازارەکانی سەرانی قوڕەیش و موشریکەکان،)) بەڵام دوای ئەوەی گەیشتن بەبراکانیان لەمەدینە دەست و دەسەڵاتیان بەهێزبوو بەمەش ڕێگەیان پێدرا تۆڵە بستێننەوە لەستەمکارانیان لە مەککە، جا خودا فەرمووی :{ **أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ**}الحج: ٣٩

پاشان لەسەریان فەرزو پێویست کرا کە بجەنگن لەدژی تەنها ئەوانەی شەڕیان لەدژ دەکردن، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی :ـ

{**وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ**}البقرة: ١٩٠

پاشان جەنگ و کوشتارکردنی موشریکەکان بەگشتی لەسەریان فەرزو پێویست کرا، لەمەشدا

خودای کردگارو بەتوانا فەرمووی :ـ

---

(١) **تفسير ابن كثير/٢٦٨.**

(٢) **رواه احمد في مسنده ٢ : (٥٠) و(٩٢)وابوداود وصححه الالباني ..**

{**وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً**} التوبە: ٣٦

ئەمانەیە پلەکانی ڕێگەدان بەجیهادکردن، کە لەسەرەتای ئیسلامدا قەدەغەکرابوو پاشان ڕێگەی پێ درا پاشان پێویست کرا لەدژی ئەوانەی دەست پێشخەربوون لەجەنگ، پاشان فەرزوپێویست کرا لەدژی هەموو موشریکەکان[١][*]. شێخ حسن البنا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: زانایان کۆدەنگن بەموجتەهیدو موقەلیدەکانەوە، بەسەلەفیەکان و خەلەفەکانەوە لەسەر ئەوەی جیهاد فەرزی کیفایەیە لەسەر ئوممەتی ئیسلامی بۆئەوەی بانگەوازی ئیسلامی بلاوبێتەوە وە فەرزە لەسەر هەموو تاکێک (**فرض عين**) بۆ بەرپەچ دانەوەی بێ باوەڕان کاتێک هێرش بکەنە سەر ئوممەتی ئیسلامی[٢][*].

دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودە پاکەکانی پێغەمبەر(ﷺ)لەسەر گەورەیی و پلەوپایەی ئەم فەریزەیە زۆرن و لەژمارە نایەن بەڵام بۆ ئامۆژگاری و بەیادهێنانەوە چەند دەقێک دەخەینە ڕوو : خوای پەروەردگار دەفەرمووێ :ـ

{**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ، تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ، يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**}الصف: ١٠ – ١٢

لەم ئایەتە پیرۆزە چەند ماناو وانەیەک بەدی دەکەین :ـ

١ – خودای گەورە ڕزگاربوون لەئاگری بەئێشی دۆزەخ و بەدەست هێنانی لێخۆشبوونی فروانی خۆی و چوونە بەهەشتی بەستاوەتەوە بە باوەڕهێنان بەخواو پێغەمبەرو جیهادکردن لەڕێگای خوا.

٢ – بازرگانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە زەرەرو کەسەری تێدانەبێ و قازانجی مسۆگەربێ، کە ئەویش بازرگانیە لەگەڵ خوودا.

٣ – زانست و شارەزایی لای ئەو باوەڕدارانەیە کە جیهاد دەکەن لەڕێگای خوا، چونکە ئەوان ڕێبواری ئەو ڕێیەو کارمەندی

---

(١) البحر الرائق في الزهد والرقائق : ١٤٨ – ١٤٩

(٢) الجهاد للشيخ حسن البنا.

ئەوبوارەن کە پەروەردگاریان بۆی هەڵبژاردوون. {**ذالكم خيرٌ لكم إن كنتم تعلمون**}

جا ئەگەر جیهاد بووە بەروبوومی زانست و شارەزایی کەسێ، ئەوا ئەوکەسە لەلایەن خودا ڕێنمایی کراوەو خراوەتە سەر ئەو هەقەی کە خەڵک لەبەرامبەریدا چوون یەک نین، هەروەکو ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ:

((**ولهذا كان الجهاد موجباً للهداية التي هى محيطة بأبواب العلم كما دل عليه قوله تعالى**: {وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ} العنكبوت: ٦٩

**فجعل لمن جاهد فيه هدايته جميع سُبُلِهِ تعالى، ولهذا قال الإمامان عبدالله بن المبارك واحمد بن حنبل وغيرهما : إذا اختلف الناس في شئ فانظروا ماذا عليه أهل الثغر فإنَّ الحقّ معهم لأن الله يقول**:- { ***وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنّ اللّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ*** }))[1]

واتە: لەبەرئەوە جیهاد هۆکارێکی پێویستە بۆ ئەو ڕێنماییەی هەموو دەرگاکانی زانستی گرتۆتەوە هەروەکو فەرمایشتی خودای گەورە ئاماژەی بۆ کردووە کە دەفەرمووێ:- { ***وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنّ اللّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ*** } کەواتە خودا ڕێنمایی هەموو ڕێگاکانی خۆی[*] دەدا بەوکەسەی جیهاد دەکات لەپێناوی، هەرلەبەر ئەوەشە پێشەوایان عبداللە کوڕی مبارک و احمد کوڕی حنبل و کەسانی تریش فەرموویانە:ـ ئەگەر خەڵک ناکۆکیان لەهەر شتێک هەبوو (بچووک یان گەورە) تەمەشاکەن و بزانن

---

(١) مجموع الفتاوى٤٤٢/٢٨.

(*) ڕێگای خودا تەنها ڕێگایەکە بەڵام لێرە کە بەکۆ هاتووە، دیارە ئەو کردارە چاکانەیە کە موجاهید ئەنجامیان دەدات لەکاتی جیهاد کردنەکەیدا لەنوێژو پاڕانەوەو ئارامگرتن و فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری کردن لەخراپەو سەنگەرنشینی (**المرابطة**) و هی تر...

خەڵکانی نێو سەنگەرو بەرەکان لەسەر چ ڕاو بۆچوونێکن، چونکە هەق و ڕاستی لەلای ئەوانە، خوداش فەرموویەتی:ـ { ***وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ*** }کەواتە لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا کە قە یرانی کە می باوە ری پاک و پیاوی باوەڕدارە، جیهاد بەڵگەو پێوانی باوەڕدارەتی و پیاوەتی یە، هەروەکو خودای زاناو شارەزا دەفەرمووێ :ـ

{إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ} الحجرات: ١٥

واتە : بەڕاستی باوەڕداران ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە بەخوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پاشان هیچ گومان و دوودڵیەکیشیان نەبووە، جیهادیان کردووە لەڕێگای خوا بەماڵ و گیانیان، ئا ئەمانە ڕاستگۆکانن (ڕاست دەکەن کە دەڵێن باوەڕدارین) .شیخ عبدالرحمن **السعدي** لە تەفسیری { *أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ* } دەفەرمووێ :

-

((**أي الذينَ صَدَقوا إيمانَهُم بأعمالهم الجميلة، فإن الصدق دعوى عظيمةٌ في كل شيئ يحتاج صاحبه الى حجةٍ وبرهان وأعظمُ ذالك دعوى الايمان الذي هو مدار السعادة والفوزالأبدي**

**والفلاح السرمدي، فمن اّدعاهُ وقام بواجباته ولوازمه فهو الصادق المؤمنُ حقاً، ومن لم يكن كذلك عُلِمَ أنه ليس بصادقٍ في دَعواهُ وليس لدعواه فائدة فإن الايمان في القلب لايطلع عليه إلا اللّهُ تعالى** .))

واتە : ئەوانەی ڕاستی باوەڕەکەیان سەلماند بەکردەوە جوانەکانیان، چونکە ڕاستگۆیی بانگەشەیەکی گەورەیە لەهەموو شتێکدا خاوەنەکەی پێویست دەکات بەڵگەو نیشانەی هەبێ بۆ سەلماندنی ڕاستگۆییەکەی، لەهەمووشیان گەورەتر بانگەشەی باوەڕداریەتی یە کە چوارچێوەی بەختەوەری و سەرکەوتنی هەتاهەتایی و ڕزگاربوونی بەردەوامە، جا هەر کەسێک بانگەشەو لافی باوەڕلێبدات و پێویستیەکانی ئەنجام بدات ئەوا ڕاستگۆیەو باوەڕداری ڕاستەقینەیە، بەڵام هەرکەسێک

وانەبێت و کردەوە پێویستیەکانی بۆ ئەنجام نەدابێت ئەوا ڕاست ناکات لەم بانگەشەیەیداو هیچ سوودێکی بۆی نابێت ئەم بانگەشەیەی، چونکە باوەڕی ناودڵی تەنها خودای گەورە پێی دەزانێ .

کەواتە باوەڕدار دەبێ و پێویستە لەسەری خۆی شارەزای ئەم بوارەبکات چ لەڕووە دەروونی و زانستە شەرعیەکەی دا، چ لەڕووی مەشق و هێزو توانای لاشەیی کە پێشەکی یە بۆ چوونە نێو جیهادو کوشتار، هەروەکو علی کوڕی حسین (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ:ـ

(( **كُنا نُعلَم مَغازيَ النبي** (ﷺ) **كما نُعلَمُ السورة من القرآن**)) [1].

واتە : ئێمە وەک چۆن فێری سورەتەکانی قورئان دەکراین ئەوهاش فێری جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکراین .

هەروەها واقدی دەفەرمووێ : گوێم لە محمد کوڕی عبداللّه بوو دەیووت : لە الزهری مامم بیستووە کە دەیفەرموو :ـ

((**في علم المغازي علم الأخرة والدنيا**)) [2].

واتە : لەزانستی جەنگ و کوشتارەکان زانستی دوارۆژو دونیای تێدایە .

هەروەها خودای زانا بەپەنهانەکان شایەتی باوەڕداری ڕاستەقینە بۆ ئەوانە دەدات کە جیهاد دەکەن لەپێناوی، کە دەفەرمووێ:ـ

{وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوْا وَنَصَرُوا أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ} الأنفال: ٧٤

واتە : ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردووە و جیهادیان کردووە لەڕێگای خواو ئەوانەی جێگەیان بۆ برا کۆچبەرکانیان کردۆتەوەو یارمەتیان داون و پشتیوانیان کردوون ئائەوانە باوەڕداری ڕاستەقینەن بۆ ئەوانە لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزیەکی بەپێزو بەڕیز لەبەهەشتدا هەیە.

---

(١) البدایە والنهایە ٣/٢٥٦.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو..

بەڵێ ئەمانە لەپێناو گەیشتن بەم خۆشی و بەختەوەریە یەکجارەکیەی بەهەشت، هەرچی ناخۆشی و ناسۆری هەیە چەشتیان، ناخۆشی و ناسۆریەک کە هۆکارن بۆ سەرەنجامێکی خۆش و پڕبەخت، هەروەکو خوای زاناو شارەزا دەفەرمووێ :-

{كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ}

واتە : جەنگ و کوشتارتان لەسەر فەرزو پێویست کراوە هەرچەندە بۆئێوە ناخۆشەو پڕ لەناسۆریە (بێ گومان ئەمە لەلایەنی جەستەییەوە، بەڵام لەلایەنی دەروونیەوە زۆر دڵی پێ ئارامەو ڕۆحی ئاسوودەیە چونکە وا لەنێو بازرگانیەکدایە کە لەهەموو بوارێک تێیدا براوەیە) .

لەوانەیە شتێکتان لەلا ناخۆش بێت کەچی خێری دونیاو دوارۆژ لەودابێت،

{وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ}

وە لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت (لەوانەش دانیشتن و دەرنەچوون بۆ جیهاد) کەچی زیان و زەرەری بۆئێوە تێدابێت، بەڵێ زیانی دونیایی جیهادنەکردن ژێر دەستەیی و ژیانێکی پڕ ژانە، لەدوارۆژیشدا تاوانباری و سزای پەروەردگار، هەربۆیە خودای زانا بە پەنهانەکان دەفەرمووێ :-

**{وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ} البقرة: ٢١٦**

واتە : خودا هەرخۆی دەزانێ ( خێر لەچی دایەو زیان و خراپە لەچی دایە) وەئێوە نازانن .

بۆیە باوەڕدار دەبێ خۆی ڕابێنێ لەئەنجام دانی ئەوشتانەی کە لەسەر نەفس و جەستە قورس و ناخۆشە چونکە لەلای خوا ئەم جۆرە کارانە خۆشەویستن، هەروەکو عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :-

**(أحبُ الاعمال الى الله ما أكرَهَت عليه النفوس)**[1]

واتە : خۆشەویسترین کردەوە لەلای خودای گەورە ئەوانەن کە لەسەر نەفس قورس و ناخۆشن .

---

(١) **كتاب ذم الهوى** :٤٠

وەلەبەرئەوەش کە ئەو ڕێگایەی بۆ بەهەشت دەچێت و دەورەی بەهەشتیش بەناخۆشی دەورە دراوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ :ـ (**حُجِبَتِ النارُ بِالشَهَواتِ وحُجِبَت الجنةُ بالمكارِه**)[١]

ڕێگای جیهادو تێکۆشان ڕێگایەکە پێغەمبەرانی تێدا شەهیدو بریندارکراوە، زانایانی تێدا زیندانی کراوە، هەق بێژانی تێدا لەسێدارەدراوە، پیاوچاکانی تێدا دەربەدەرکراوە، قورئانەکانی تێدا دڕێندراوە، مزگەوتەکانی تێدا سوتێنراوە، ئافرەتی داوێن پاکی تێدا هەتک کراوە.

هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

{أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ ۖ مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ } **البقرة**: ٢١٤

واتە : پێتان وایە هەروا بەئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێ تەنگانەو ناخۆشی) ؟ مەگەر نموونەی باوەڕدارانی پێش ئێوەتان بۆباس نەکراوە کەتووشی کوشت و بڕین و تەنگانەی زۆرهاتبوون و تەکانیان خواردبوو تاڕادەیەک پێغەمبەرەکەو ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵی بوون دەیانووت :کەی سەرکەوتنی خوا دێت ؟ دڵنیابن کە سەرکەوتنی خودا نزیکە.

هەروەها دەفەرمووێ :ـ

**{أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ}** آل عمران: ١٤٢

واتە : ئێوە لاتان وایە ئەوها بەئاسانی دەچنە بەهەشتەوە، تا خوای گەورە لەڕۆژگارتاندا بزانێ کامانەن لەئێوە کە جیهادو کۆشش دەکەن و بزانێ کامانەن کە خۆڕاگرن و ئارام دەگرن. ؟

ابن القيم دەفەرمووێ : (**أنكر عليهم حسبانهم وظنهم دخول الجنة بغير جهاد ولاصبر، وأن حكمته تأبى ذلك، فلا يدخلونها الا بالجهاد والصبر**)[٢]

---

(١) **رواه البخاري** /٦٤٨٧..

(٢) **صحيح إغاثة اللهفان** : ٦٠٥

واتە : خودای گەورە ئەو گومانەیانی ڕەتکردەوە کە پێیان وابێ بەبێ جیهادو خۆڕاگری بچنە بەهەشت، چونکە حیکمەتی خودا ئەمە ڕەت دەکاتەوە، بۆیە ناچنە بەهەشت تەنها بەجیهادو خۆڕاگری نەبێ .

هەروەها ابن القیم لەباسی ڕێگای جیهاددا دەفەرمووێ :ـ

((**طريق تعب فيه آدم، وناح لأجله نوح، ورمي في النار الخليل، وأضطجع للذبح إسماعيل، وبيع يوسف بثمن بخس، ولبث في السجن بضع سنين، ونشر بالمنشار زكريا، وذبح السيد الحصور يحيى، وقاسى الضر أيوب، وزاد على المقدار بكاء داود، وسار مع الوحش عيسى، وعالج الفقر وأنواع الأذى محمد (ﷺ)وعلى جميع إخوانه المرسلين**) [1]

واتە : ڕێگایەکە ئادەم تێیدا ماندووبووە، نوح لەپێناویدا ناڵاندوویەتی، ابراهیم فڕێ دراوەتە ناو ئاگر، اسماعیل لەسەر خاک درێژکراوە بۆ سەربڕین، یوسف بەنرخێکی کەم تێیدا فرۆشراو چەندین ساڵ لەزیندان ماوە، زەکەریا بەمشار دوولەت کرا، گەنجی شکۆداری پاک یحیا سەربڕا، أیوب هەموو چەشنێکی نەخۆشی تێدا چەشت، وەتێیدا داود زیاد لەئەندازەی خۆی گریا، وە عیسای تێدا دەربەدەرکرا تا لەگەڵ درندەکان دەرۆیشت بەڕێوە[*]،وە محمد (ﷺ)تێیدا هەژاری و هەموو ئەشکەنجەو ئازارێکی بینی .

ئینجا لەپێش هاتنی ڕۆژی دوایی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دائەبەزی بۆسەر زەوی بۆ چەند مەبەستێک[2]ـ

١ – بانگەشەی جولەکە بەتاڵ ئەکاتەوە گوایە کوشتویانە، بەڵکو ئەو دەیانکوژێ.

---

(١) الفوائد : ٥٦.

(*) لەلای ئیمامی **قرطبي** یەکێک لەماناکانی نازناوی (المسيح) ی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ): **لأنه مسح الارض، أي ذهب فيها فلم يستكن بكن**، واتە : بەزەویدا گەڕاوەو تێیدا ڕۆیشتووە بەدوای شوێن و حەشارگەیەک و دەستی نەکەوتووە. الجامع الاحكام القرآن (٥٧/٤).

(٢) أصحاب الحق بين فتن الخارج والداخل : ٨١ – ٨٢

٢ – بۆمردنی دەبێ بگەڕێتەوە سەر زەوی، چونکە هەموو مرۆڤێک دەگەڕێتەوە بۆ نێو زەوی خودا فەرموویەتی : {**قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ**}الأعراف: ٢٥

٣ – کاتێ هەواڵی کۆتا پێغەمبەرو (ﷺ)سیفەتی ئوممەتەکەی پێدرا لەخودا پاڕایەوە کە ببێتە یەکێک لەم ئوممەتە، خواش نزاکەی قەبوڵ کردو هێشتیەوە بۆ ئەم ڕۆژە تا ئایینی ئیسلام تازەبکاتەوەو (لەگەڵ موجاهیدانی ئەم ئوممەتە لەو ڕۆژەدا) جیهاد بکەن لەدژی جولەکەو دەجالیش بکوژرێ بەدەستی عیسای کوڕی مەریەم.

٤ – بەدرۆخستنەوەی هەموو ئەوانەی بانگەشەی خوایەتی یان کوڕی خوایان دەکرد بۆ عیسای کوڕی مەریەم.

ئایا ئەوەندە شەرەفە بەس نیە بۆ ئەم ئوممەتە موجاهیدەکە پێغەمبەرو (ﷺ)پێشینە چاکەکانیان موجاهید بووینە ؟

خودای پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرمووێ :ـ

{**لَكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَأُولَـٰئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ وَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ** }التوبە: ٨٨

واتە : (بەڵام ئەگەر دووڕووەکان ڕازی بوون بەوەی بەجێ بمێنن لەگەڵ ئافرەت و منداڵ و پەککەوتەکان)، ئەوا پێغەمبەرو ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدان جیهادو کۆششیان کردووە بەماڵ و گیانیان بۆیە بۆ ئەمانەیە هەرچی خێروچاکەی دونیاو دوارۆژە، هەر ئەمانەش سەربەرزو سەرفرازن.

سەرفرازو شکۆمەندم کەلێرە بەندم ئەندامێکی ئوممەتی نەبی ئەحمەدم
بەدایک و باوک و عێل و عەشیرەت قوربانی ڕێت بین خاتەمی نبووەت
ئەی خاوەن هەنگاوی بەگوڕی دەعوە ئەی شیرین گوفتارو بەرزی کردەوە
ئەی خاوەن جەستەی ڕۆژوو تعّبد ڕۆژ لەنێو خەڵک و شەو لەنوێژ تهّجُد
ئەی خاوەن بازووی بەتینی جیهاد سوارچاکی جەنگ و مەیدانی خەبات
تۆهاتی شەو نەما ڕوناک بو دونیا بت باوی نەما پەرسترا خوای تەنیا
ئەی خوایە ئێستاش من هەر بەندەتم پێم ببەخشە بۆدین هیممەت و غیرەتم

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)سەرمەشقی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەیە کە دەستیان تەنها لەدوژمنانی دین وەشاندوەو شمشێریان تەنها لەسەر گەردنی بێ باوەڕان تیژ بووە، هەروەکو ئەنەسی کوڕی مالک(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: ـ

**(ما ضرب (ﷺ) بيده خادماً قط ولا امرأةً، ولا ضرب رسول الله (ﷺ)بيده شيئاً قط، إلا أن يجاهد في سبيل الله)** (١)

واتە : هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەدەستەکانی لەهیچ خزمەتکارێک و هیچ ئافرەتێکی نەداوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەدەستی خۆی لەهیچ شتێکی نەداوە هەرگیز، مەگەر تەنها جیهادی لەپێناو خوادا کردبێ (دەستی لەبێ باوەڕان وەشاندبێ) .

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ : ـ

**{فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا، دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا}**النساء: ٩٥ – ٩٦

واتە : خودای گەورە ئەو موجاهیدانەی تێ دەکۆشن بەماڵ و گیانیان هەڵی بژاردوون بەسەر دانیشتووەکاندا بە پلەیەک، بۆ هەمووشیان خودا بەڵێنی چاکی داوە بەڵام خودای گەورە موجاهیدانی پایەدارکردووە بەسەر دانیشتووەکان بە پاداشتێکی گەورە چەندین پلە کە لەلایەن خۆیەوە پێیانی بەخشیووە لەگەڵ لێخۆشبوون و بەزەیی، خوداش زۆر لێخۆشبوو بەزەییە.

بەڵام ئایا ئەم پلەیە چەندە ؟ ئەگەر چەندین پلەیە نێوانی دووپلە چەندە ؟ با وەڵامی ئەم پرسیارانە لە پێغەمبەر (ﷺ)وەربگرین کە دەفەرمووێ : ـ

**(مَن آمن بالله ورسوله وأقام الصلاة وآتى الزكاة وصام رمضان كان حقاً على الله أن يُدخِلَهُ الجنة، هاجر في سبيل الله أو جلس في أرضه التي وُلد فيها.**

---

(١) **صحيح رواه احمد عن عائشة كمافي سلسلة الصحيحة (٥٠٧).**



**قالوا** : **يا رسول الله** : **أفلا نُنبئُ الناس بذالك** ؟

**قال** : **إن في الجنة مائة درجة، اعدها الله للمجاهدين في سبيله، مابين الدرجتين، كما بين السماء والأرض، فإذا سألتم اللهَ فاسألوهُ الفردوس، فإنه وسط الجنة، وأعلى الجنة، ومنه تفجَرُ أنهارُ الجنة، وفوقه عرش الرحمن**[1].

واتە : هەرکەسێک باوەڕ بهێنێ بەخوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) نوێژ ئەنجام بدات و زەکات بدات و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت ئەوا خودا لەسەر خۆی پێویست کردووە کە بیخاتە بەهەشت، جا کۆچ بکات لەپێناوخودا یان دانیشتبێ لەو خاکەی لێی لەدایک بووە.

ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم هەواڵە بەخەڵک ڕانەگەیەنین ؟

فەرمووی : بەڕاستی لەبەهەشت دا سەد پلە هەیە، خودای گەورە دایناوەو ئامادەی کردووە بۆ موجاهیدانی ڕێگای خۆی، نێوانی هەر دووپلەیەک، وەکو نێوانی ئاسمان و زەویە، جا ئەگەر داوای بەهەشتتان کرد لەخودا ئەوا داوای فیردەوسی لێبکەن، چونکە ئەو ناوەڕاستی بەهەشتەو بەرزترین پلەی بەهەشتە، دەریاکانی بەهەشت لەوێدا هەڵدەقوڵێ، سەرووشی عەرشی خودایە.

ئەم فەرموودەیەو دەیان فەرموودەی تریش هەن ئاماژەن بۆئەوەی کەوا باوەڕدار نابێ لەبوونی جیهادو پێویستی گۆڕەپانی جەنگ بە موجاهید، خۆی خەریک بکا بەنوێژو ڕۆژوو، بەڵکو لەسەردەمێکی وەکو ئەمڕۆماندا کە موسڵمانان لەهیچووڵاتێکدا لەسەرخاکی خۆیان سەربەخۆو خاوەن دەسەڵاتێکی ئیسلامی نین، بەڵکو لەلایەن داگیرکارانی ناوەخۆ،خراونە ژێر فەرمانڕەوایەتی دەسەڵاتێکی عەلمانی بەکرێ گیراوی ڕۆژئاواو ئەمریکاو مل کەچ کراون بۆ بەرنامەو بڕیار گەلێکی یاساو دەستوورە دەستکردەکان، پێویستە باوەڕداران بۆ سەلماندنی ڕاستی باوەڕەکەیان لەلایەک و پاراستنی لەلایەکەی ترەوە، ئەم

(١) **أخرجه البخاري برقم** : ٢٧٩٠.

فەریزەیە جێ بەجێ بکەن کە گەورەترین و خۆشەویسترین کارە لەدوای بڕیاری باوەڕهێنانیان، هەروەکو ابو هریرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : سُئِلَ رسول الله (ﷺ)

**أيُ العمل أفضل** ؟ **قال** : **ايمان بالله ورسوله** .

**قيل** : **ثم ماذا** ؟

**قال** : **الجهاد في سبيل الله** .

**قيل** : **ثم ماذا** ؟

**قال** : **حجٌ مبرور**[1].

واتە : پرسیار لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا کەوا باشترین کردەوە چی یە ؟

فەرمووی : باوەڕهێنان بەخوداو پێغەمبەرەکەی .

ووتیان پاشان چی یە ؟

فەرمووی : جیهادکردن لەپێناو خودا .

ووتیان پاشان چی یە ؟

فەرمووی : حەج کردنێکی پاک و وەرگیراو.

هەروەها لە أبی قتادەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕدراوەتەوە کە : **أن رسول الله قام خطيباً، فذكر أن الجهاد في سبيل الله والايمان بالله أفضل الأعمال**[2].

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری دا، تێیدا باسی ئەوەی کرد کەوا جیهاد کردن لەڕێگای خواو باوەڕهێنان بەخوا چاکترین کردەوەن.

کەواتە کە تۆ نوێژ دەکەی خۆت ڕزگاردەکەی لەبەندایەتی کردنی نەفسی خۆت، بەڵام ئەگەر جیهادت نەکرد ئایا کێ موسڵمانان و خاکیان ڕزگاربکا لەبەندایەتی کردنیان بۆ تاغوت و کەلەگایەکان ؟!

زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کەوا بەرژەوەندی تایبەت دەفەوتێندرێت بەمەبەستی بەدەست هێنانی بەرژەوەندی گشتی؛

---

(١) رواه البخاري برقم : ٢٦ ومسلم برقم : ٨٣.

(٢) اخرجه مسلم برقم ١٨٨٥.

**المصلحة الخاصة تُفَوَت بغرض تحصيل المصلحة العامة.**

بۆنموونە : خزمەتکردنی دایک و باوک، چاکەو بەرژەوەندی تایبەتن، بەڵام لەکاتێک ئایین پێویستی بەخزمەتکردن دەبێ بەوەی بەرگری لێ بکرێ، ئەوا ئەم بەرژەوەندیە تایبەتیە وازی لێ دەهێنرێت .

هەروەکو عبدالله کوڕی عمرو (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرمووێ :

**جاء رجل الى رسول الله (ﷺ) فسأله عن أفضل الأعمال ؟ قال : الصلاة، قال : ثم مه ؟ قال : الجهاد، قال : فإن لي والِدَين، فقال : آمرُك بوالديك خيراً، فقال : والذي بعثك بالحق لأجاهدن وأتركهما، قال : فأنت أعلم**[1]..

واتە : پیاوێک هاتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پرسیاری لێ کرد لەوەی باشترین کردەوە چی یە ؟ فەرمووی : نوێژ، کابرا ووتی : پاشان چی یە ؟ فەرمووی جیهاد، کابرا ووتی : من دایک و باوکیشم هەیە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : فەرمانت پێ دەکەم بەچاکە لەگەڵ دایک و باوکت،

کابرا ووتی : سوێند بەوخودایەی تۆی بەهەق ڕەوانەکردووە دەچم جیهاد دەکەم و بەجێیان دێڵم .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : تۆ باشتر دەزانی .

ابن حجر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەئاست ئەم فەرموودەیە بێ دەنگ بووە کەواتە (حسن)ە یان (صحیح)ە، فەرموویەتی : ئەم فەرموودەیە بۆجیهادی فەرزی عەینە بۆ ڕێککەوتنی نێوان فەرموودەی تر کە چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکی پێش جیهادکردن خستووە.

هەروەها بەشیری کوڕی خەصاصیە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ :-

(**أتيتُ رسول الله (ﷺ) لأبايعة على الاسلام، فاشترط علَيَ : تشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمداً عبده ورسوله، وتُصلي الخمس،**

---

(٢) رواه ابن حبان وصححه.



**وتصوم رمضان وتؤدي الزكاة، وتَحجُ البيت، وتجاهد في سبيل الله....**

**قلت : يارسول الله : أما اثنتان فلا أطيقهما : الزكاة، لأنه ليس لي إلا عَشر ذُودٍ، هُنَ رسلُ أهلي وَحمولَتُهُم.**

**وأما الجهاد فإنهم يزعمون أنه من وَلَى فقد باء بغضبٍ من الله، وأخافُ إن حَضرني قتال كرهتُ الموت، وخَشَعت نفسي، فقبض رسول الله(ﷺ)يده ثم حركها، ثم قال : لاصدقة، ولاجهاد، فبماذا تدخل الجنة ؟**

**قلت : يا رسول الله : أبايُعك، فبايَعَني عليهِن كُلِهِن**[1]..

واتە : هاتمە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) تاوەکو بەیعەتی پێ بدەم لەسەر ئیسلام، جا مەرجی دانا لەسەرم کەوا دەبێ : شایەتی بدەی کەهیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لەخودا، محمد (ﷺ) بەندەو نێردراویەتی، وە پێنج نوێژەکان ئەنجام بدەی، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبی، زەکاتیش لەماڵەکەت دەربکەی، هەروەها حەج بکەی بۆ ماڵی خودا، وە جیهاد بکەی لەڕێگای خودا ....

ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بەدووان لەمانە ناتوانم جێ بەجێیان بکەم، یەکیان زەکاتە، چونکە من تەنها دە ووشترم هەیە کە سەرچاوەی شیرن بۆ خانەوادەکەم و بەکاریان دەهێنین بۆ گواستنەوەو هاتوچۆمان.

ئەوی تریان جیهادە چونکە دەڵێن هەرکەسێک ڕابکات ئەوا تووشی تووڕەیی خودا دەبێتەوە، منیش دەترسم لەکاتی کوشتارو جەنگدا ڕقم لەمردن ببێتەوە و بترسم.

لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی گرت و پاشان هەژاندی، ئینجا فەرمووی : ماڵ نابەخشی و جیهاد ناکەی ئەی بەچی دەچیە بەهەشت ؟

---

(١) **أخرجه البيهقي في السنن الكبرى : ٢٠/٩ والحاكم في المستدرك ٨٠/٢ وصححه ووافقه الذهبي.**

ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەواتە بەیعەتت پێدەدەم ، جا ئەوەبوو بەیعەتی لێ وەرگرتم لەسەر هەموویان .

کەواتە نابێ هیچ شتێک ببێتە کۆسپ و ڕێگر، بەڵکو دروست نیە هیچ شتێک بکەیە بیانوو عوزر بۆ نەکردنی جیهاد ، چونکە ئەنجام نەدانی جیهاد (بەبێ بوونی عوزری شەرعی) مانای وایە شتێکی دونیایی هەڵبژێردراوە بەسەر سەربەرزی موسڵمانان و پاداشتی دوارۆژ، ئەمەش بێ گومان لەئەنجامی خۆشویستنی ئەم شتە یان ئەم کەسە دێت زیاتر لەخۆشویستنی خوداو پێغەمبەری خواو (ﷺ) و جیهادکردن لەڕێگای خوا ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

**{قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ}التوبة: ٢٤**

واتە : ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ : ئێوە ئەگەر دایک و باوکەکانتان و کوڕەکانتان و خێزانەکانتان و تیرەو هۆزەکانتان و ئەوماڵ و سامانەی پەیداتان کردووەو بازرگانیەک کە دەترسن زیان و تێداچوونی بەسەربێ و خانوو تەلارێک کە پێی ڕازین و دڵ خۆشن ئەگەر ئەوانەتان لەلا خۆشەویستربوو لەخواو پێغەمبەرەکەی و جیهادکردن لەڕێگای دا ئەوا چاوەڕێ بن تا خوای گەورە فەرمانی خۆی دەدا بەسزادانتان، خوداش ڕێنمایی ئەوکەسانە ناکات کە لەگوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەردەچن.

دەبێ موسڵمانان ئەوەندە بێ باک بن لە هەڕەشەکانی خوا بەسزادانیان کە دوای خوێندنەوەی ئەم ئایەتانەش هەر مل بدەن بەدونیا ؟

مەگەر لەناو سزاکەی خوادا ناژین، کەوا لەناو پاشکۆیی و ژێر دەستی ستەمکاران تەمەنیان لەناودەچێ ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ)سەرەنجام و ئاکامی وازهێنان لەجیهاد و کۆشش ئاشکرادەکات کە دەفەرمووێ :ـ

(**إذا تبايعتم بالعينة، وأخذتم أذناب البقر، ورضيتم بالزرع، وتركتُمُ الجهاد، سَلَطَ اللهُ عليكم ذُلاً، لاينزعه حتى ترجعوا إلى دينكم....**) [1]

واتــە : ئەگــەر کــڕین و فرۆشــتنتان کــرد بــە عینە(بــەوەی کەسێک شتێک بفرۆشێت بەیەکێکی تر بەنرخێکی دیاری کراو بۆکاتێکی دیاری کراو پاشان هەر لەکڕیار بەنرخێکی کەمتر بیکڕێتەوە، ئەمە دروست نیەو حەرامە)، وە دەستتان گرت بەکلکی مانگا (واتە بەدوای پارەوپول پەیداکردن کەوتن)، وە دڵخۆش و ڕەزامەندیش بوون بە بەرژەوەندی خۆتان لە کەسابەت (واتە بەرژەوەندی گەورەتان فەرامۆش کردو ئەرکی پاراستنی ئایینتان پشت گوێ خست) بەوەش جیهادو کۆشش کردنتان لەم پێناوەدا وازهێنا، ئەوکاتە خودای گەورە بەهۆی دەستبەرداربوونتان لەهۆکاری سەربەرزی و شکۆمەندی، سزاتان دەدات بەوەی ژێر دەستی و بێ هێزی یەک دەهێنێ بەسەرتان، لای نادات لەسەرتان، تا نەگەڕێنەوە بۆسەر ئایینەکەتان.

دەی حــاڵ و بــاری موســڵمانانی ئــەمڕۆ زۆر لــەوەخراپترە کــە فەرموودەکە باسی دەکات، ئەمڕۆ موسڵمانان زۆر بەئاشکرایی و زۆر بەبڵاوی نەوەک هەرتەنها (**عینة**) بەڵکو کەوتونەتە ناو ڕیباخۆری، هەمووش لەژێر بیانووی بەناچاری، ئینجا زۆر بەشێوەیەکی سەیر روویان کردۆتە کۆکردنەوەی پارەوپول بەبێ گوێ دانە حەرامی و حەڵاڵی، ئەمە سەرەڕای نقوم بوونیان لەنێو گێژاوو لافاوی ئەم هەموو تاوانانەی دەسەڵاتدارانی عەلمانی بەدیاری و نرخێکی زۆر هەرزان بۆیانی هێناون لەلایەن سەران و ئاغا جولەکەو گاورەکانیان، لەهەمووی بەڵاو نەهامەتی تر ئەوەیە کە نەک هەر وازیان لەجیهادکردن هێناوە بەڵکو جیهاد بەتیرۆر و موجاهیدانیش بەتیرۆریست ناوزەدکراون، بەمەش بوونەتە یارمەتیدەرو پشتیوانی بۆ دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی دەسەڵاتە زۆردارەکان، **ولا حول ولاقوة إلا**

---

(١) **حديث صحيح أخرجه ابو داود ٣/٧٤٠ وأحمد ٣٣/٧**.

**بالله العليُ العظيم**، بۆیە ابن النحاس (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی فەرموودەکەدا دەفەرمووێ :ـ(**دل قوله** (ﷺ): ((**حتى ترجعوا الى دينكم**)) **على أن ترك الجهاد والاعراض عنه والسكون الى الدنيا، خروجٌ عن الدين ومفارقة له، وكفى به ذنباً وإثماً مبيناً**)[1]

واتە : فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (تا دەگەڕێنەوە بۆلای ئایینەکەتان) ئاماژەیە بۆئەوەی کە وازهێنان و پشت کردن لەجیهادو ڕووکردنە دونیا، دەرچوونە لەئایین و جیابوونەوەیە لێ ی ئەمەش بەسە کە چ تاوان و گوناهێکی ئاشکرایە .

**جرِّد السيفَ أبا بكرٍ فما طبِعَ السيفُ ليبقي مغمداً**

ئەو بەهەشتەی کە { ***عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ*** }
آل عمران: ١٣٣

پانیەکەی بەئەندازەی پانی ئاسمانەکان و زەوی یە، کەوتۆتە ژێر سێبەری ئەو شمشێرانەی لەپێناو خودا ڕادەوەشێندرێن هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

(**وَاعلموا أنَ الجنة تحت ظِلالِ السيوف**)[2]

واتە : بزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە.

هەربەهەشت و دواڕۆژ ؟ بەڵکو ژیانێکی سەربەرزانەو گوزەرانێکی شکۆمەندانەش هەر لەوەڵامدانەوەی بانگەوازی جیهادو کوشتارە. هەروەکو لەبارەی ئایەتی : {**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ**} الأنفال: ٢٤

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە وەڵامی خوداو پێغەمبەر (ﷺ)بدەنەوە کاتێک بانگتان دەکەن بۆشتێک کە ژیانی ئێوەی تێدایە، عروەی کوڕی زوبیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : (ئەو شتە ئەو جەنگەیە کە خودا بەهۆیەوە ئێوەی سەربەرزو

---

(١) **تهذيب كتاب مشارع الاشواق الى مصارع العشاق/٤١**..

(٢) **رواه البخاري برقم** :٢٨١٨.

شکۆمەندکرد دوای بێ هێزی و بێ دەسەڵاتیتان، بەهۆیەوە ئێوەی پاراست لە دوژمنەکەتان دوای ئەوەی بەسەرتان باڵا دەست بوون) [١].

ئینجا لەم ڕۆژگارە تاڵەدا بێ باوەڕان زیاد لەسەر چەوساندنەوەی موسڵمانان، سوکایەتیشیان پێ دەکەن بۆیە خودای زاناو کردار، کوشتارکردنیان بەتاکە ڕێگە داناوە تا وازبێنن و سنورێکیان بۆ دابنرێ :-

{**وَإِن نَكَثُوا أَيْمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ**} التوبە: ١٢

واتە : ئەگەر پەیمانەکانیان شکاند لەدوای بەڵێنەکانیان و تانەو تەشەرو سوکایەتیان کرد بە ئایینەکەتان، ئەوا بجەنگن و کوشتاری سەرانی کوفر بکەن چونکە بەڕاستی ئەمانە پەیمان و بەڵێنیان نیەو نایبەنەسەر، کوشتاریان بکەن بەڵکو بەمە وازدەهێنن لەتانەدان لە ئایینەکەتان .

کەواتە هەروەکو لەسەرەتادا باسمان کرد، ئەوا سەلمێنرا کەوا جیهاد کردن لەڕێگای خوا بەڵێ ئەو بازرگانیەیە کە بەهیچ شێوەیەک زەرەری تێدا بەدی ناکرێ، یان ژیانێکی سەربەرزانە، یان مردنێکی مەردانە، کە لەدواڕۆژدا پاداشتەکەی ژیانێکی نەبڕانە، هەروەکو خودای خاوەن موڵک و دەسەڵات دەفەرمووێ :-

{**وَمَنْ يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا**} النساء: ٧٤

واتە/ هەرکەسێک کوشتار بکات لەپێناو خودا جا چ بکوژرێ یان سەرکەوێ ئەوا پاداشتێکی گەورەی پێ دەبەخشین .

هەروەها دەفەرمووێ :{ **قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلَّا إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ**} التوبە: ٥٢

واتە : پێیان بڵێ : ئایا ئێوە چاوەڕێن چی بەسەر ئێمەدابێ جگە لەیەکێک لەدووشتە چاکەکان (سەرکەوتن یان شەهیدی) نەبێ؟

(١) تفسیر ابن کثیر / ٢٥٩:.

ئەم دووسەرەنجامە شیرینەیە کە غیرەت و پیاوەتی بەباوەڕدار دەبەخشێ لەوەی نەترسێ لەووتنی قسەی هەق، نەترسێ لەڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاری دڵ ڕەق، هەروەکو ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : گویێم لە شیخ الاسلام ابن تیمیە بوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەیفەرموو : ـ

(( **انظر الى مُوسى (صلوات الله وسلامه عليه) -رمى الألواح التي فيها كلام الله الذي كتبه بيده فكسرها، وجر بلحية نبي مثله، وهو هارون، ولطم عين ملك الموت ففقأها، وعاتب ربَهُ ليلة الإسراء في محمد (ﷺ)ورفعهِ عليهِ، وربُهُ تعالى يحتمل له ذلك كُلُه، ويُحِبُهُ ويُكرِمُهُ، لأنه قام لِله تلك المقامات العظيمة في مقابلة أعدى عدوِله، وصدع بأمره، وعالج أمتَي القبط وبني اسرائيل أشد المعالجة، فكانت هذه الامور كالشعرة في البحر**)) [(١)].

واتە : سەیری موسا بکە (ﷺ)- ئەو تەختانەی فڕێ داو شکاندی کە خودا بەدەستی خۆی ووتەکانی خۆی تێدا نوسیبویەوە، ڕیشی پێغەمبەرێکی وەکو خۆی ڕاکێشا، کە هارونی برای بوو، وە مستێکی لەچاوی ملک الموت داو تەقاندی، لەشەوی شەوڕۆیی کردنی پێغەمبەر محمد (ﷺ) گلەیی لەخوا کرد لەسەر پلەو پایەی پێغەمبەرمان بەسەریدا، لەگەڵ هەموو ئەمانە کەچی خوای پەروەردگار هەرچاوپۆشی لێ دەکردو خۆشی دەویست و ڕێزی لێ دەنا، چونکە موسا (ﷺ) بۆخوا چەند هەڵوێستێکی گەورەی نواند لەڕووبەڕوو بوونەوەی سەرسەخترین دوژمنی، فەرمانی خودای بەئاشکرایی و بەڕاشکاوی پێ ڕاگەیاند، هەردوو نەتەوەی قبگ و نەوەی ئیسرائیلی ڕزگارکردو بەچاکترین شێوە ڕێنمایی دەکردن، بۆیە ئەم کارانەی کە لەپێشوودا کردی وەکو تاڵە موویێک بوون لەناو دەریا.

---

(١) **تهذيب مدارج السالكين/١٦٩.**

مەگەر جیهادو ڕووبەڕووبوونەوەی مەردانەی سعدی کوڕی ئەبی وەقاص نەبوو، کەوای لەپێغەمبەر کرد (ﷺ) پێی بڵێ: (**إرمِ فِداك أبي وأمي**)[1]

واتە: بهاوێژە، باوک و دایکم بەقوربانت بێ.

شمشێر ئەو کەرەستەیە کە هەروەک چۆن کەللە ڕەقەکانی پێ جیادەکرێتەوە لەلاشە، ئەوهاش بەردو بتە ڕەقەکانیشی پێ جیادەکرێتەوە لەژیانی خەڵکی و دەشکێندرێ، جا کەرستەیەک ببێتە هۆی نەهێشتنی شیرک و بێ باوەڕی، شایستەیە کەبەهەشت بکەوێتە ژێر سێبەری، هەربۆیەش پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) ئەم کەرستەیان بەکارهێناوەو ئەم بتانەشیان شکاندووە کە بێجگە لەخوا دەپەرستران، هەروەکو ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ:-

(( **وكل ماينذر له، أو يعظمة من الأحجار أو الاشجار، ونحوها، يجب أن يُزال، لأنه يحصل للناس به ضرر عظيم في دينهم، كما كسر الخليلُ** (**عليه السلام**) **الاصنام، وكما حرق موسى** (**عليه السلام**) **العجل، وكما كسر رسول الله** (ﷺ) **الاصنام وحرقها لما فتح مكة**..)) [2]

واتە: هەموو ئەوانەی نەزری بۆ دەکرێ، یان بەگەورە دادەنرێ لە بەردو دارو شتی تر لەمانە، پێویستە لاببرێت، چونکە بەمانە زیانێکی گەورە بەئایین و بڕوای خەڵکی دەگات، هەروەک چۆن لەبەر ئەمە ابراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) بتەکانی شکاند، هەروەکو موسا (سەلامی خولی لێ بێ) گوڵکەکەی سوتاند، بەهەمان شێوەش پێغەمبەر (ﷺ) لەئازادکردنی مەککە بتەکانی تێک شکاند.

ئینجا لەپێش هاتنی ڕۆژی دواییش عیسای کوڕی مەریەم (علیە السلام)خاچ دەشکێنێ و دەجالیش دەکوژێ.

---

(١) رواه البخاري/٤٠٥٥، ومسلم/٢٤١٢.

(٢) اقتضاء الصراط المستقيم (٢/٦٤٤ – ٦٤٦)..



لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە کاری پێشینە چاکەکانمان بووە لەهاوەڵانی بەڕێزو تابعین (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) هەروەکو **أبي الهياج الاسدي** دەفەرمووێ :ـ

علی کوڕی ئەبی تالب پێی ووتم : ((**ألا أبعثُكَ على ما بعثني عليه رسول الله (ﷺ) أن لاتَدعَ تمثالاً إلا طمستَهُ، ولا قبراً إلا سَوَيتَهُ**)) (١).

واتە : ئایا ڕەوانت نەکەم بۆ ئەوشتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) منی بۆ ڕەوانەکردووە ؟ بەوەی هەر بتێکت دیت بیشکێنی، هەر گۆڕێکت بینی (بەرزکرابۆوە بە گەورە سەیر دەکرا) لەگەڵ زەوی یەکسانی بکەی.

کەواتە بەهێزی چەک و هێرشی چەکداری، گەورەیی و پیرۆزی دەگەڕێتەوە بۆ ئاینی خوا، سنورێکیش دادەنرێ بۆ بێ باوەڕی و تاوان و سەرپێچی کردنی خوا، بۆیە ئەنجامدانی ئەرکی جیهاد نیشانەی خۆشەویستی خودایە بۆ ئەو باوەڕدارانەی پێی هەڵدەستن، ابن تیمیە دەفەرمووێ :ـ (**جعل الله لأهل محبته علامتين : اتباع الرَسول والجهاد في سبيلهِ، وذلك لان الجهاد حقيقة الاجتهاد في حصول مايُحبه الله مِن الايمانِ والعمل الصالح، ومِن دفع ما يبغضه الله من الكفر والفسوق والعصيان**)) (٢).

واتە : خوای گەورە دوونیشانەی داناوە بۆ ئەوانەی خۆشیانی دەوێن : شوێنکەوتنی پێغەمبەرو جیهادکردن لەپێناوی، چونکە جیهاد بریتیە لەهەوڵ و کۆششی ڕاستەقینە لەهێنانەدی ئەوەی خودا پێی خۆشە لەباوەڕو کرداری چاک، وە لابردنی ئەوەی خودا پێی ناخۆشە لەبێ باوەڕی و تاوان و سەرپێچی.

بێ گومان ئەوان لەخۆشەویستی تەواویان بۆخوای گەورە، جیهاد دەکەن بۆ جێ بەجێ کردنی هەموو ئەوانەی خودا فەرمانی

---

(١) **رواه مسلم في صحيحه كتاب الجنائز** (٩٦٩).

(٢) **العبادة وحقيقة العبودية** : ٤١.

پیێ کردووە، ڕقی تەواویشیان لەهەموو ئەوانەیە کە خودا قەدەغەی کردووەو هەوڵ دەدەن بۆ نەهێشتنی،

بۆیە خوداش ئەوانی خۆشویستووە هەروەکو ابن تیمیە(ڕەحمەتی خوای لیێ بیێ) دەفەرمووێ: ـ

(**والجهاد يتضمن كمال محبة ما أمرالله به، وكمال بغض ما نهى الله عنه ولهذا قال في صفة من يُحِبُهُم ويُحبُونه {أذِلَةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ }** المائدە: ٥٤.
(١)

بیێ گومان ئەوەی لەم ڕۆژگارەش بڵاوەو ڕوودەدا لەبیێ باوەڕی و سوکایەتی بەئایین و تاوان و سەرپیێچی بەئاشکراو ڕاشکاوی فەرمانی خوداو پیێغەمبەری خوا(ﷺ) جیێگای غەم و خەفەتباری موسڵمانی ڕاستەقینەیە، بۆیە لیێرەش دەبیێ هەرموسڵمانیێک کە بینینی ئەم خەڵکەی لەسەر ئەم شیێوازەی لەلا گرانەو پیێی دڵ تەنگ و خەفەتبارە هەوڵ و کۆشش بکات بۆ نەهیێشتن و لابردنی ئەم بارو حاڵە ناخۆش و تاڵە،

هەروەکو پیێغەمبەری خوا دەفەرمووێ: (**عليكُم بالجهاد في سبيل اللّه تعالى، فإنَهُ باب من ابواب الجنة، يذهبُ اللّهُ به الهَمَ والغم**) [٢].

واتە : دەست بگرن بەجیهادکردن لەپیێناو خودای گەورە، چونکە دەرگایەکە لەدەرگاکانی بەهەشت، خوای گەورە بەهۆیەوە غەم و خەفەت لادەبات.

هەروەکو ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لیێ بیێ) دەفەرمووێ : ـ

| | |
|---|---|
| **هـذا ونصـرالدينِ فـرضٌ لازمٌ** | **لا للكفاية بـل علـى الاعيـانِ** |
| **بِيَـدٍ إمـا باللِّسـانِ فـان عجـزت** | **فبالتوجـه والـدعا بجنـانِ** |
| **مابعـد هـذا واللّهِ للإيمـانِ** | **حبـة خـردلٍ ياناصـرالإيمان**[٣] |

واتە:

---

(١) العبادة وحقيقة العبودية :٥٤.

(٢) اخرجه الحاكم وغيره، سلسلة الاحاديث الصحيحة (١٩٤١).

(٣) النونية الكافية الشافية في الانتصار للفرقة الناجية..

سەرخستنی ئایین فەرزەو پێویستە لەسەرگشت کەسێ کەخاوەن هەستە
بەدەست یا بەزوبان،گەر نەتتوانی بە ڕووکردنە خواو نزای دەروونی
لە دوای ئەمە بەخوا نامێنێ باوەڕ بەقەد دەنکێکیش ئەی سەرخەریباوە ڕ

ئینجا کەدونیا، دونیای ئەسباب و هۆکارە، لەکاتی بوونی توانا لەدابین کردنی هێزو سوپا، نزاو پاڕانەوە بەتەنها هیچ سوودێکی نابێ و سکالا و بێزاری دەربڕین هیچ کاریگەری نابێ لەگۆڕینی قۆناغێکی تاڵ و غەمگین، بەڵکو دەبێ سەری مار پان بکرێتەوە ئینجا پاشماوەی لە وولات دووربخرێتەوە، هەروەکو شاعیر دەڵێ :ـ

**الشكوى لا تجدي نفعا مادامت في الارض الأفعى**
**السيف دواءٌ فعالٌ وَالنَصرُ حليفُ لِلمَسعى**
**العالم يهتف للأقوى في وقت الفتنة والبلوى**
**فأعدوا لذلك ما أسطعتم والضعف قرينٌ للشكوى**

واتە :ـ

سکالا هیچ سوودت پێ ناگەینێ مادام لەم خاکە مار دەفیشکێنێ
شمشێر چارەسەرەو زۆر کاریگەرە سەرکەوتن هاوشانی هەوڵی بە فەرە
خەڵکی بۆ بەهێز وا هەڵدەپەڕێ لەڕۆژگارێ کە فیتنە یەخەت ئەگرێ
دەی ئامادەکەن لە هەموو تواناکان بێ هێزی هاوشانە بۆسکالاکانتان

ڕەنگە خەڵکێکیش بیانوو بۆ دەستەوسانی خۆیان بەوە بهێننەوە کەئەمە قەدەری خوایەو لەئاستیا هیچمان لەدەست نایە، بەڵام باابزانین ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) چۆن وەڵامی ئەم کۆمەڵانە دەداتەوە کە دەفەرمووێ :ـ

((**كُلُ من احتج بالقدر فإنه متناقض فإنه لايمكن أن يُقَر كُل آدمي على مافعل، فلابُدَ إذا ظلمه ظالم أو ظلم الناسَ ظالمٌ وسعى في الارض بالفساد وأخذ يسفك دماء الناسَ ويستحل الفروج ويُهلك الحرث والنسل ونحو ذلك من أنواع الضرر التي لاقوام للناس بها أن يُدفع هذا القدر، وأن يُعاقب الظالم بما يكف عدوانه وعدوان امثاله**

**فيُقال له إن كان القدر حُجة فَدَع كل أحدٍ يفعل مايشاء بك وبغيرك وإن لم يكن حجة بَطُلَ أصل قولك حُجةً...))** [١]

واتە : هەرکەسێک قەدەریکات بەبیانوو ئەوا خۆی قسەکەی بەتاڵ دەکاتەوە چونکە ناکرێ بێ دەنگی بکرێ لەهەموو کەسێک لەوەی دەیکات، پێویستە ئەگەر ستەمکارێک ستەمی لێکرد یاخود ستەمکارێک هات و ستەمی لەخەڵک کردو هەوڵی خراپەکاری دا لەسەر زەوی و دەستی کرد بەخوێن ڕشتن و ناموس بردنی خەڵک و لەناوبردنی کێڵگەو بژێوی خەڵک و نەوەکان و چەندین جۆری تر لەم زیان و خراپانەی قورسن لەسەر ئەستۆی خەڵکی پێویستە ئەم قەدەرە لابربردرێت و ئەم ستەمکارە سزابدرێت تا دەست درێژی یەکەی و دەست درێژی ستەمکارانی وەک ئەو کۆتایی پێ دەهێنرێت، ئینجا بەوکەسە دەووترێت کە بیانوو بەقەدەر دەهێنێتەوە ئەگەر قەدەر بیانووە ئەوا لێگەڕێ باهەموو کەسێک چ لەتۆو خەڵکی دەکات، بابیکات ئەگەر بیانووش نیە ئەوا بنچینەی قسەکەت بەتاڵ بووەوە کە دەڵێ ی بیانووە .

کەسانێکیش لەوانەی پێشوو خراپتر، نەک دەستەوسانن بەڵکو دەچنە ڕیزی داروەدەستەکانی تاغوتەکان و خزمەت بەمانەوەی دەسەڵاتیان دەکەن بەبیانووی ئەوەی ناچارن و بژێوی ژیانیان پێ هەڵناسوڕێ !!

بەڕاستی ئەمە نەناسینی خودای گەورەو نەزانینە بەناوەجوان و سیفەتە بەرزەکانی، ئینجا گومانی خراپە بەدەسەڵات و دەوڵەمەندی خودای پەروەردگار، سەرەنجامی ئەم گومانە خراپەش ئەوەیە دەبنە بەندەی ئەوتاغوتانە لەبەر ئەو پول و سامانەی لەبەردەستیانە،

هەروەکو ابن تیمیە دەفەرمووێ :ـ

**(فالعبد لابد له من رزق وهو محتاج الى ذلك، فإذا طلب رزقه من الله صار عبداً لله فقيراً إليه، وإن طلبه من مخلوق صار**

---

(١) **العبادة وحقيقة العبودية** / ١٨.

**عبداً لذلك المخلوق فقيراً إليه، ولهذا كانت مسألة المخلوق محرمة في الأصل وإنما أبيحت للضرورة)**[١].

واته : بەندە هەردەبێ ڕزق و ڕۆزیەکی هەبێ چونکە پێویستیەتی، ئینجا ئەگەر ڕزقەکەی لەخوا داواکرد ئەوا دەبێتە بەندەی خواو هەژاری بەردەم بارەگای خوا، بەڵام ئەگەر داوای لەکەسێک و دروستکراوێک کرد ئەوا دەبێتە بەندەی ئەو دروستکراوەو هەژاری بەردەم بارەگاکانی ، بۆیە داواکردنی شت لەمرۆڤەکان هەر لەبنچینەدا قەدەغەکراوە بەڵکو تەنها بۆکاتی زۆر ناچاری ڕێگەی پێ دراوە.

کەواتە دەبێ تەنها لەخوای تەنها داوای ڕزق و ڕۆزی بکرێ هەروەکو دەفەرمووێ:ـ

**{فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ}** العنكبوت: ١٧

گرنگترین سەرچاوەو فراوانترین دەرگای ڕزقیش بریتیە لەجیهاد کردن لەڕێگای خوا، هەروەکو پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) دەفەرمووێ:ـ

**(....وجُعِلَ رزقي تحت ظلِ رمحي...)**[٢]

واتە : ڕزق و ڕۆزیەکەم خراوەتە ژێر سێبەری ڕمەکەم .

خوای گەورەش دەفەرمووێ : **{فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا}** الأنفال: ٦٩

واتە : بخۆن لەوەی دەستتان کەوتووە لەجەنگدا حەڵاڵ و ڕزقێکی پاکە .

لەسەر ئاستی گەلان و نەتەوەکانیش دەبینی لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا و لەئەنجامی وازهێنان لەجیهادو تێکۆشانی ڕێی خودا وولاتانی موسڵمان لەگەڵ بوونی ئەم سەرچاوە گەورەیەی سامانی سروشتی لەناوچەکانیان، کەچی چاو لەدەستی دوژمنان و داخ لەدڵانی ئەم

---

(١) العبادة وحقيقة العبودية : ٣١.

(٢) رواه احمد في مسنده.

ئاییندن، کە بێ گومان ئەمەش بەشێکە لەوژێر دەستی و بێ هێزی و لاوازیەی کە لەئەنجامی وازهێنانیان لەهۆکاری سەربەرزیان کەوتۆتە سەریان، هەروەکو پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ (...**سلط الله عليكم ذُلاً..**) [(١)].

ئەمەش ئەو سزایەیە کە لەفەرموودەیەکی تردا ئاماژەی پێ کردووە کە دەفەرمووێ :ـ

(**ماترك قومٌ الجهاد إلَا عَمَهُمُ اللّهُ بِالعذاب**) [(٢)]

واتە : هەرگەلێک واز لەجیهاد بهێنێ ئیلا خودا هەموویان سزادەدات.

ئینجا هەرکەسێک ڕازی بێت بەم ژێر دەستی یەو ڕۆژێک لەڕۆژان بیر لە گۆڕینی ئەم ڕۆژگارە تاڵە نەکاتەوە و لەسەری بمرێت ئەوا لەوەدا دەچێتە سەر ڕەوشتی دووڕووەکان، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

(**من مات ولم يغزُ، ولم يُحدث به نفسه، مات على شُعبةٍ من النفاق**)رواه مسلم

واتە : هەرکەسێک بمرێت و جەنگ و جیهاد نەکات و نیازیشی نەبێت بیکات، ئەوا لەسەر لقێکی دووڕوویی دەمرێت.

ئەگەر ترسیش هەیەو هۆکارێکە لەدواخستنی جیهاد، ئەوا سەرەنجام ئەو مردنە هەرپێت دەگات کە لێ ی دەترسی، بەڵکو ئەو کەسەی کە لەپێناو خودا شەهید دەبێت، ئازاری کوشتن و گیان دەرچوونەکەی زیاترنیە لەئازاری گەستنی مێروولەیەک هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ـ

(**مايجد الشهيد من ألم القتلِ إلَا كما يجد أحدُكُم من مَسِ القرصة...**) [(٣)]..

---

(١) رواه ابوداود بأسناد حسن وصححه الالباني.

(٢) أخرجه **الطبراني**، وەلە : سلسله **الاحاديث** الصحيحه دا هاتووەبە ژمارە ٢٦٦٣.

(١) **أخرجه الترمذي والنسائي وابن ماجه واسناده حسن.**

ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ)دەرکیان بەگەورەیی پاداشتی ئەم فەریزەیە کردبوو بۆیە تەنها وەستانیان لەنێو گۆڕەپانی جەنگ دا لەلا گەورەتربوو لە هەموو خواپەرستیەکانی تر، هەروەکو عبداللە کوڕی عمر (خوا لەخۆی و باوکی ڕازی بێت) دەفەرمووێ :ـ

((**لِأن أقف موقفاً في سبيل الله مواجهاً للعدو، لا أضرب بسيف، ولا أطعن برمح، ولا أرمي بسهمٍ، أفضل من أن أعبدالله ستين سنة، لا أعصيه**)) (١)

واتە : سوێند بەخوا ئەگەر بوەستم تەنها وەستانێک لەپێناو خودا ڕووبەڕووی دوژمن، شمشێر نەوەشێنم، ڕم نەچەقێنم، تیریش نەهاوێژم لام باشترە لەوەی شەست ساڵ خواپەرستی بکەم و سەرپێچی نەکەم.

هەربۆیە علی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) هانی هاوەڵانی ئەدا بۆ جەنگ و کوشتارو دەیفەرموو :ـ

(**إن لم تقتلوا تموتوا، والذي نفسي بيده لألف ضربة بالسيف أهون من موتٍ على فراش**) (٢).

واتە : ئەگەر نەشکوژرێن هەر دەمرن، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئازاری کوشتنێک کە بەهەزار شمشێر لێبدرێ، سووک و ئاسانترە لەئازاری مردنێک لەسەر جێگا.

**لئن كانت الأرزاق قسماً مقدراً فقلة حرص المرء في الرزق أجملُ**
**وإن كانت الأموال للترك جمعها فما بال متروكٍ به المرءُ يبخلُ**
**وإن كانت الدنيا تعد نفيسةً فقدر ثواب الله أعلى وأنبلُ**

---

(٢) **مشارع الاشواق** : ١٦٠.

(٢) مشارع الاشواق : ٢٢٣.



**وإن كانـت الأبـدان للمـوت أنشـئت   فقتـل إمـــرء في الله بـالسيـــف اجمـلُ**

واتـه :

ئەگەر ڕزق و ڕۆزی بەشێکی دابەشکراوە

ئەوا کەم پەرۆشی مرۆڤ تێیدا جوانترە

ئەگەر ماڵ و سامان بۆ بەجێ هێشتن کۆکراوە

ڕەزیلی کردن بەوەی بەجێ دەهێلرێ خراپترە

ئەگەر دونیا بەگرانبەها هەژمارکراوە

دەی پاداشتی خـوا بەرزترو بەنرخ تـرە

ئەگەر لاشەکان بۆ مردن دروست کراوە

کوژران لەپێناو خودا بەشمشێر چاکترە

ئازایـەتی و مەردایـەتی نیعمـەتێکی خودایـە دەیبەخشـێتە ئەوکەسـەی دەیـەوێ، بۆیـە لـەنێو ئـەم هـەموو خەڵکـەی بـەنی ئیسرائیل، تەنها دووکەس ئەم بەهرەیـەی خودایـان پـێ بەخشـرابوو، چونکە کاتێک فەرمانیان پـێ کـرا کـە بچـنە نێـو خـاکی پیـرۆز (**الارض المقدسة**) ترسـان ووتیـان {**إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ**} المائدە: ٢٢

واتـه : ئەوانەی لەو شارەدان گەلێکی زۆردارو دڵ ڕەقـن بۆیـە ئێمـە ناچینـە ناوی هەتا ئەوان لێ ی دەرنەچن، ئەگەر ئەوان لێ ی دەرچـوون ئەوکاتـە ئێمە دەچینـە ناوی.

(ئـەم گـەلـە زۆردارو دڵڕەقـەش کـە لـەناو شـارەکەدا بـوون حیپانیـەکان و فەزاریـەکان و کەنعانیـەکان بوون) [1]

((لەم کاتە ئەم دووکەسە باوەڕداره لەخوا ترسە (**قال رجُلانِ منَ الذين يخافون**) هەندێکیش بە (یُخافۆن) خوێندوویانەتـەوە بـەمانای خەڵک لێیان دەترسان.

(**أنعم اللهُ عليهما**) **أي بالاسلام والايمان والطاعة والشجاعة**)) [1]

---

(١) قصص الانبياء لابن كثير : ٢٩٠.

واتە : خودا نیعمەت و بەخششی ئیسلام و باوەڕو گوێڕایەڵی و ئازایەتی بەسەردا ڕشتبوون .

جا ترسی بەنی ئیسرائیل لەم گەلە زۆرداره سەیربوو چونکە لەپێشدا بەچاوی خۆیان لەناوچوونی فیرعەون و دارودەستەکەیان بینی بوو کە زۆر ستەمکارترو دڵڕەقتربوو بەرامبەر نەوەی ئیسرائیل هەروەک ترسی خەڵکی موسڵمانانی ئەمڕۆش لەدەسەڵاتە ستەمکارەکان زۆر سەیرترە لەکاتێکدا هەموو بەچاوی خۆیان لەناوچوونی چەندین ستەمکارو دارودەستەو دەسەڵاتیان بینی، هەر لەتاغوتی عێراق و تونس و مصرو لیبیا بگرە تا ئێستاش کە شۆڕش و ڕاپەڕینی گەلانی ستەملێکراو دژبە ستەمکارانیان بەردەوامە. زۆرجار ئەم ترسەش لەئەندازەو قەبارەی خۆی گەورەتر دەکرێت هەروەکو جارێکیان ووتیان بە جمال الدین الافغانی : ئەم داگیرکەرانە گورگن، ئەویش ووتی : ئەگەر ئێوەیان وەکو مەڕ نەبینی بایە نەدەبونە گورگ .

ئینجا مەترسی بوونی ئەم ترسە لەدوژمنان لەلایەک و خۆشەویستی ئارەزووەکانی دونیا لەلایەکی تر لەوەدایە کە بروبیانوو دروست دەکا بۆ وازهێنان لەجیهادکردن بەدەست، بەگومانی ئەوەی بەزوبان ئەنجامی دەدا، ئینجا لەگەڵ هەڕەشەو چاو سوورکردنەوەیەک ئەویش وازدەهێنێت، دەمێنێتەوە بڵێ لەدڵم پێم ناخۆشە، بەڵام ئەو پێناخۆش بوونەی دڵیشی لەگەڵ هاودەمی بوون و تێکەڵاوی ڕۆژانەی بەبێ باوەڕان و گوناهو تاوانەکانیان، ووردە ووردە نامێنێ، هەروەکو علی کوڕی أبی تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ : ـ (( **أَوَلَ ماتغلبون عليه من الجهاد، الجهاد بأيديكم، ثم الجهاد بألسنتكم، ثم الجهاد بقلوبكم، فإذا لم يعرف القلب المعروف، ولم ينكر المنكر، نكس فجعل اعلاه اسفله** )) [٢]..

واتە : یەکەم شت لەجیهادکردندا کەبەسەریدا زاڵ بن لەنەکردنیدا، جیهادکردنە بەدەستتان (بەشمشێر) ، پاشان

---

(١) قصص الانبياء لابن كثير –: ٢٩٠.

(٢) **إحياء علوم الدين** (١٤٣١/٢).



جیهادکردن بەزوبانتان نامینێ، پاشان جیهادکردنی دڵەکانتان نامینێ، جا ئەگەر دڵیش چاکەی نەناسی و خراپەشی پێ ناخۆش نەبوو، ئەوا هەڵدەگەڕێتەوە ئەوسا سەرەوەی دەکەوێتە ژێرەوەی .

ئینجا پرسیار ئەوەیە کە ئایا ئەگەر خوای گەورە دروستی کردووی و ڕۆحی بەلاشەدا کردووی، پاشان ویست و ئارەزوو و ئازادی پێ بەخشیوی و ڕزق و ڕۆزی بۆ مسۆگەرکردی، دواجاریش پێی ڕاگەیاندووی کە گیان و ژیانت، کۆتایی و سەرەنجامی تەمەنت هەرهەمووی بەدەست و وویستی خوای گەورەیە، ئایا دوای ئەم هەموو ڕاستیە ترس لەچی ؟

{إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} ال عمران١٧٥

کەواتە : (( **إذا كان الموتُ لابُدَ منهُ فَمِنَ العارِ أن يموت المرءُ جَباناً** ))

**سُبحانك اللهُمَ وبحمدك أشهد أن لا إله إلاّ أنت**

**أستغفرك وأتوب اليك**

**وصلى الله على نبينّا محمد وعلى آلهِ وسلّم تسليماً**

## گرنگترین سەرچاوەکان

((قورئانی پیرۆز))

١ – **تفسير القرآن العظيم/ابن كثير – دار احياء التراث العربي** – چاپی یەکەم.

٢ – **الجامع لأحكام القرآن (القرطبي) لمحمد بن احمد القرطبي – دارالكتب المصرية – ١٤٥٧هـ** .

٣ – **تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان/للسعدي – تحقيق** : **عبدالرحمن بن محلا اللوحيق.**

٤ – **في ظلال القرآن، لسيد قطب – دار الشروق، بيروت** – چاپی پێنجەم .

٥ – **تفسير التحرير والتنوير، لابن عاشور – دارسحنون – تونس**

٦ – **صحيح البخاري – تحقيق احمد محمد شاكر – دار ابن الجوزي** - چاپی یەکەم.

٧ – **صحيح مسلم بشرح النووي – دار الفكر** - چاپی یەکەم.

٨ – **فتح الباري شرح صحيح البخاري، لابن حجر –تحقيق: محب الدين الخطيب– دارالمعرفة.**

٩ – **صحيح أغاثة اللهفان، لابن القيم – تحقيق** : **محمد احمد عيسى .**

١٠ – **مجموع فتاوى ابن تيمية، جمع عبدالرحمن بن قاسم وابنه محمد** - چاپی یەکەم ١٣٩٨هـ .

١١ – **اقتضاء الصراط المستقيم، لابن تيمية – تحقيق** : **ناصر بن عبدالكريم – مكتبة الرشد .**

١٢ – **جامع الرسائل، لابن تيمية، تحقيق** : **محمد رشاد سالم .**

١٣ – **الصارم المسلول على شاتم الرسول، لابن تيمية – تحقيق** : **محي الدين عبدالحميد- دارالكتب .**

١٤ – **اعلام الموقعين عن رب العالمين، لابن القيم الجوزية .**

١٥ – **مدارج السالكين، لابن القيم، تحقيق** : **محمد حامد الفقى – مطبعة السنة المحمدية .**

١٦ – **بدائع الفوائد، لابن القيم – مكتبة القاهرة ١٣٩٢هـ** - چاپی دووەم .

١٧ – **التبيان في اقسام القرآن، لابن القيم – دارالكتب العلمية – بيروت ١٤٠٢هـ .**

١٨ – **الوابل الصيب ورافع الكلم الطيب – لابن القيم الجوزية** .

١٩ – **شرح نونية ابن القيم، لاحمد بن عيسى – المكتب الاسلامي ١٤٠٦**، چاپی سێ یەم.

٢٠ – **الاستقامة، لابن تيمية – تحقيق** : **محمد رشاد سالم** .

٢١ – **طبقات الحنابلة – ابن رجب الحنبلي** .

٢٢ – **الشفا بتعريف حقوق المصطفى – للقاضي عياض – تحقيق** : **على محمد البجاوي – دارالكتاب العربي** .

٢٣ – **البداية والنهاية – لابن كثير الدمشقي** .

٢٤ – **حلية الاولياء وطبقات الاصفياء، لأبي نعيم الاصفهاني – دارالكتب العلمية**- چاپی یەکەم.

٢٥ – **فتح المجيد لشرح كتاب التوحيد – عبدالرحمن بن حسن بن محمد بن عبدالوهاب – دار ابن حزم.**

٢٦ – **الفوائد – لابن القيم – مطبعة الإمام – القاهرة** .

٢٧ – **منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة القدرية، تحقيق** : **محمد رشاد سالم** .

٢٨ – **شرح العقيدة الواسطية – محمد بن صالح العثيمين – دار الثريا ١٤٢٦** – چاپی دووەم .

٢٩ – **العبادة وحقيقة العبودية – لابن تيمية، تحقيق** : **عامر طاهر الشيخلي – مكتب العز – ,١٩٨٩**

٣٠ – **معالم في طريق ، لسيد قطب، المركز العربي للدراسات والابحاث** – چاپی یەکەم .

٣١ – **تهذيب الاسماء واللغات، النووي – الرسالة العالمية** - چاپی یەکەم.

٣٢ - **نواقض الايمان القولية والعملية، عبدالعزيز بن محمد بن علي العبداللطيف – مدار الوطن** – چاپی هەشتەم.

٣٣ - **الإيمان – عبدالله عبدالحميد الاثري – دار طيبة** - چاپی یەکەم .

٣٤ - **شرح كتاب كشف الشبهات، صالح بن فوزان – مؤسسة الرسالة** - چاپی یەکەم .

٣٥ - **دولة المغول والتتار بين الانتشار والانكسار، على محمد صلابي – دارالمعرفة** - چاپی یەکەم .

٣٦ - **شرح السنة، للبغوي – تحقيق : شعيب الأرناؤوط – المكتب الاسلامي** - چاپی یەکەم .

٣٧ - **شرح الفقه الأكبر، لأبي حنيفة النعمان، لعلي قاري – دار الكتب العلمية** - چاپی یەکەم .

٣٨ - **معارج القبول بشرح سلم الوصول، لحافظ بن احمد الحكمي – دار الإفتاء – الرياض** .

٣٩ – **مراتب الإجماع – لابن حزم – دار الكتب العلمية – بيروت** .

٤٠ – **تهذيب مشارع الاشواق الى مصارع العشاق، لابن النحاس، تحقيق : صلاح عبدالفتاح الخالدي – دارالعلوم**.

٤١ – **قواعد في بيان حقيقة الإيمان عند أهل السنة والجماعة – عادل بن محمد بن علي الشيخاني** .

٤٢ – **حقيقة التوحيد، محمد حسان – مكتبة فياض** .

٤٣ – **البحر الرائق في الزهد والرقائق – احمد فريد – مؤسسة الكتب الثقافية** – چاپی دووەم .

٤٤ - **العمدة في اعداد العدة ، عبدالقادر بن عبدالعزيز** .

٤٥ – **الصواعق المحرقة في الرد على أهل البدع والزندقة، احمد بن حجر الهيتمي – المكتبة العصرية**.

٤٦ – **اصحاب الحق بين فتن الخارج والداخل، جاسم بن محمد بن المهلهل الياسين – شركة السماحة**- چاپی یەکەم.

٤٧ - **المغنى لابن قدامة – مكتبة الرياض الحديثة – الرياض** .

٤٨ – **المحلى لابن حزم – تصحيح** : **حسن زيدان طلبة – مكتبة الجمهورية العربية – القاهرة** .

٤٩ – **تعظيم قدر الصلاة – محمد بن نصر المروزي – تحقيق** : **عبدالرحمن الفريوائي-مكتبة الدار** - چاپی یەکەم .

٥٠ – **إنجيل برنابا – ترجمة من الانكليزية، د.خليل سعادة – مطبعة المنار** .

٥١ – هەندێ سەرچاوەی تر.



## ناوەرۆک


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی | ٤ |
| بەشی یەکەم | ٨ |
| ـ چەمک و مانای بیروباوەڕ (**تعريف العقيدة**) | ٩ |
| ـ مانای ((**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**)) (معنى **لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه**) | ١٢ |
| ـ مانای باوەڕ ((معنى الايمان)) | ١٣ |
| ـ باوەڕ گوفتارو کردارە (الايمان قول وعمل) | ١٥ |
| ـ مانای تاغوت و جۆرەکانی (**معنى الطاغوت وأنواعهُ**) | ٢٩ |
| ـ جۆرەکانی بەتاک و تەنها گرتنی خودا (**أنواع التوحيد**) | ٣٦ |
| ـ مانای پەرستن (**العبادة**) و جۆرەکانی | ٥١ |
| بەشی دووەم | ٥٤ |
| مەرجەکانی ((**لا إِلَهَ إِلا اللَّه**)) | ٥٥ |
| یەکەم: زانیاری ((العلم)) | ٥٦ |
| دووەم: بێ گومانی ((اليقين)) | ٥٧ |
| سێیەم: ڕەزامەندبوون ((القبول)) | ٥٨ |
| چوارەم: مل کەچ بوون ((الأنقياد)) | ٥٩ |
| پێنجەم: ڕاستگۆیی ((الصدق)) | ٦٤ |
| شەشەم: خوا پێ مەبەست بوون ((الأخلاص)) | ٦٥ |
| حەوتەم خۆشویستن ((المحبە)) | ٦٥ |
| هەشتەم: مردن لەسەری ((الموت عليه)) | ٦٧ |
| بەشی سێ یەم | ٧١ |
| هاوەڵ دانان (شیرک) و جۆرەکانی | ٧٢ |

| | |
|---|---|
| شیرکی گەورە | ٧٢ |
| شیرکی بچوک و جۆرەکانی | ٨٠ |
| مانای (الکفر) | ٨٥ |
| جۆرەکانی کوفری گەورەش بریتین | ٨٦ |
| ١- بەدرۆخستنەوە (**كُفر التكذيب**) | ٨٦ |
| ٢- ڕەت کردنەوەو خۆ بەگەورە زانین (**كُفر الإباء والاستكبار**) | ٨٦ |
| ٣- گومان و دوودڵی (**كُفر الشك والظن**) | ٨٧ |
| ٤- پشت لێ کردن (**كُفر الإعراض**) | ٨٧ |
| ٥- دوو ڕوویی (**كُفر النفاق**) | ٨٧ |
| ٦- دان نەنان (**كُفر الجحود**) | ٨٨ |
| ٧- گوێڕایەڵی نەکردن (**كُفر التولي عن الطاعة**) | ٨٨ |
| ٨- لاسایی کردنەوە (**كُفر التقليد**) | ٨٨ |
| ٩-سوکایەتی کردن (**كُفر الأستهزاء**) | ٨٩ |
| ١٠- ڕق لێ بوونەوە (**كُفر البغض والكراهية**) | ٨٩ |
| بەشی چوارەم | ٩٢ |
| حوکم نەکردن بەقوڕئانی پیرۆز | ٩٣ |
| دۆستایەتی کردن و دوژمنایەتی کردن | ١١٤ |
| بەشی پێنجەم | ١٢٣ |
| مانای بەشی دووەمی شایەتمان (محمد رسول الله) | ١٢٤ |
| یەکەم: باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ) | ١٢٥ |
| دووەم: بەڕاستی زانینی هەموو فەرموودەو هەواڵەکانی | ١٣٢ |
| سێیەم: گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی | ١٣٥ |
| چوارەم: خۆ دوورخستنەوە لەوشتانەی قەدەغەی کردووە | ١٣٥ |
| پێنجەم: خۆشویستنی بەبێ زیادە ڕۆیی | ١٣٧ |





| | |
|---|---|
| بەروبوومی خۆشویستنی پێغەمبەر(ﷺ) | ١٤١ |
| حوکمی جنێودان و بێ ڕێزی کردن بە پێغەمبەر(ﷺ) | ١٤٣ |
| بەشی شەشەم | ١٤٦ |
| ـ دوو ڕوویی (النفاق) و جۆرەکانی | ١٤٧ |
| ـ تیشکی قوڕئان لەسەر بیروڕاو ڕەفتاری دووڕووان | ١٥٠ |
| ـ دەرچوون لە گوێڕایەڵی کردن (الفسق)و جۆرەکانی | ١٥٧ |
| بەشی حەوتەم | ١٦٠ |
| ـ پلەو پایەو گەورەیی تەنها خواپەرستی | ١٦١ |
| ـ چوار بناغەی کارو سێ بنچینەی باوەڕ | ١٦٥ |
| پایەی ئیسلام و ڕوکنەکانی | ١٦٦ |
| ـ پێگەی نوێژ لەباوەڕو حوکمی نوێژنەکەر | ١٦٨-١٦٩ |
| بەڵگەکانی ئەو زانایانەی نوێژ نەکەر بەکافر دادەنێن | ١٧٢ |
| پایەی باوەڕو ڕوکنەکان | ١٨١ |
| پلەو پایەی جیهادکردن لەڕێگای خودا (عزوجل) | ١٩٠ |
| گرنگترین سەرچاوەکان | ٢١٩ |
| ناوەڕۆک | ٢٢٢ |